# لەجیاتی پێشەکی

ئەم کۆمەڵە نووسینە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە هەژموونی ئایین و ناسیۆنالیزم لە کۆمەڵگەی کوردی دەدوێ. بەشێکی زۆری ئەم نووسینانە لێرەو لەوێ بڵاوکراونەتەوە، تەنیا بەشی سەرەکی ناونیشانەکە نەبێ کە لە هیچ شوێنێك بڵاو نەکراوەتەوە. خوازیارم شیابم بابەتیانە لەم بابەتە بدوێم و هەقی بابەتەکەم دابێت.

سەلام ناوخۆش

٢٠٠٦/٩/٢٥

# گوتاری ناسیۆنالیستی کوردی

## ١- ناسیۆنالیستی کوردی و ژیانی حیزبایەتی

دەگوترێ کە ناسیۆنالیستی دەرهاوێشتەی شۆرشی فەرەنسی و ئینگلیزی بێت، مارکسەتیش گوتەنی ئەومەسەلەیە بزافێکی پاشکەوتوی سەرمایەداری یە، بەو واتایە ناسیۆنالیستی نەك هەر لەناو کورد بەلکو لەجیهانی بەناو ئیسلامیش فۆرمی دروستی خۆی نیە. جارێ سەبارەت بەکوردەوە خودی مەسەلەکە زیاتر کاردانەوە بووە نەك کردار. هەتا تورك وعەرەب وفارس لەئیسلام هەڵنەگەڕانەوە لە بریتی دین پەسەندی کەلتوری دۆزی نەتەوەی خۆیان نەکرد کورد هەر باوەڕی بە" برایەتی" هەبوو. هەر ئلەسەدەی هەژدەهەمەوە ڕوناکبیرێکی وەك مەلائەحمەدی خانی دەرکی بەوە کردووە کەئەو نەتەوە هاوسێیانە لەگەڵ کورد ڕاست نین. لە سەدەی نۆزدەهەمیش ڕۆناکبیرێکی تر وەك حاجی قادری کۆیی هەمان بانگەوازی کوردانە" ئاراستەی میرانی کورد" کردووە، بەلاّم چەند دەسەلاّتی ئەو نەتەوانە لەگەڵ میللەتەکەمان ڕاست نەبووینە ئەوەندەش (بەلکو زیاتریش!)دەسەلاّتی خێلەکی کوردی کە خۆی لە دامودەزگای میروئاغا وشێخ دەنواند، لەگەڵ میللەتی خۆیان ڕاست نەبوینە. عەقلی ئەوان تەنیا بەقەد قەلەمرەوییەکەی خۆیان بووە هەتا

ناونیشانی میرنشینەکانیشیان تەواو دەلالەت لەو واقیعە دەکات :
میرنشینی سۆران ، میرنشینی بابان ، میرنشینی بەهدینان ،
میرنشینی ئەردەلان ئەو میرنشینانە نەك هەر لەسەر بنەمای
نەتەوەیی دانەمەزرا بوون ، بەلکو رێگریش بوون لەسەر پرۆژەی
نەتەوەیی . چۆن ئێستا ئەو هەموو دەولەتە عەرەبیە نەتەوەیی نین
بەلکو رێگرن لەسەر" یەکێتی عەرەب " .........

لەو دوو سەدەیەدا ئاغاو بەگ و میروشێخی کوردی نەك هەر
نەیانتوانیوە "کوردایەتی" لەناو کوردان بلاو بکەنەوە ، بەلکو
ململانێ خێلەکی ئەو میرانە هەتا رۆژگاری ئەمرۆش
رەنگدانەوەیەکی نێگەتڤی لەبیرکردنەوەی تاکی کوردا دروست
کردووە .

هەرچەندە هەندێ لەروناکبیرانی کورد وەك ئیسحاق سکوتی و
عبداللە جودت بەدامەزرێنەری کۆمەلەی ئیتحاد وتەرەقی
دادەنرێن، بەلام بەحوکمی ئەوەی ئەو حیزبە کوردی نەبووە بۆیە
دامەزراندنی ئەو حیزبە بەدەسپێکی حیزبی کوردی دانا نرێ .
هەندێ توێژینەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کەیەکەم حیزبی
کوردی لەبەرایی سەدەی بیستەم دامەزراوە ، حیزبەکەش ناوی "
عەزمی قەومی " بووە لەپاش ئەو حیزبە لەگەل دەستپێکی
سەرکەوتنی سەرکەوتنی ئینقیلابی ١٩٠٨ هەندێ رۆشنبیری کورد
وەك ئەمین عالی بەدرخان ، عبدلقادر شەمزینی و خەلیل خۆشەوی

و كەسانی دی چەندەها كۆمەڵە وحیزبـی كوردیـان دامەزرانـدوە . كۆمەڵەی ( تەعاون وتەرقی كورد ) و(هێڤی ) وپارتی (دیموكراتی كورد ) بەدەستپێكی ژیانی حیزبی كوردی دادەنرێت ئـەو حیزبانـە رۆژ نامـەو گۆڤـاری زمـان حـالی خۆیـان هـەبووە بـۆ ئـەوەی " كوردایەتی " لەناو كۆمەڵـەی كـوردەواری بڵاوبكەنـەوە . لـەپاش ئەمانە چەندەها كۆمەڵە و حیزب لەبەشەكانی كوردستان دروسـت بوون وەك كۆمەڵە داركەران ، برایەتی ، هیوا ، شۆرش ، رزگاری ، یـەكێتی تێكۆشـین ، سـەربەخۆی كوردسـتان لەباشـووروباكور ، خۆیبون ، ژیانەوەی كوردستان – ژێ – كاف ، حیزبـی دیمـوكراتی كوردستان ، پارتی دیموكراتی كوردسـتان ، كۆمەڵـە ، كۆمەڵـەی ماركسی – لینینی ، بزوتنەوەی سۆشیالیستی ، پاسـۆك ، پـارتی گەلی دیموكراتی كوردستان ، یەكگرتن.........

ئەو جۆرە حیزبانە سەرپەرشـتی چـەندەها راپـەرینی وشۆرشـی كوردیان كردووە لەوانە :

١- راپەرینەكانی شێخ محمود ١٩١٩ -١٩٣٢
٢- راپەرینەكانی بارزان یەك ، درو، سێ
٣- راپەرینەكانی سمكۆی شكاك وسەید تەها
٤- راپەرینی شێخ سەعدی پیران ١٩٢٥
٥- راپەرینی ئارارات ١٩٢٧ -١٩٣١
٦- راپەرینی دەرسیم ١٩٣٦ – ١٩٣٨

٧- ڕاپەرینی دیموکراتی ئێران ١٩٤٥ -١٩٤٧

٨- شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١ -١٩٧٥

٩- شۆڕشی گولان ١٩٧٦ -- ١٩٨٨

١٠- شۆڕشی گەلی کوردستان ١٩٧٦ -١٩٨٨

١١- ڕاپەرینەکانی پ.ك .ك ١٩٧٨ .....؟

بێگومان هەرەس وپاشاگەردانی ونیسکۆ بەشی هەموو ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانە بووە . هۆکارەکانی ئەو شکستانە لەهەموو قۆناغەکاندا بەزۆری هەروەك یەك بووە ئەوەتە شۆڕشەکەی شێخ عبیدەاللای نەهری لە١٨٨٠ بەهۆی کۆمەڵێك فاکتەری ناوەخۆو تەبایی داگیرکەران (عوسمانی و ئێران ) وئیمپریالیزمی بەریتانی و روسیایی قەیسەری بووە دوا شۆڕشی کوردیش بووە قوربانی هەرسێ فاکتەری ناوەخۆ( ماملانێ حیزبەکان ) وبوونی زیاتر لە سێ سەد فەوجی بەرگری نیشتیمانی (جاش ) تەبایی داگیرکەران لە سەرلێدانی بزاڤی کوردی هەروەها دەسخەرۆ کردن وپشت تێکردنی ئەمریکار سۆڤیەت لەبزاڤی کوردیدا .

## ٢- قۆناغەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی

وەك ناسیۆنالیزم بەراتا رۆژئاوا ییەکەی هێشتا لەناو کوردا سەریهەڵنەداوە . دوو هۆکاری سەرەکی ئەگەری ئەم دیاردەن :

یەکەم : لەکوردستاندا هەرگیز ریفۆرمی دینی وەك

بزوتنەوەیەکی سۆسیۆدینی سەریهەڵنەداوە هەتا ئەو بزاڤە مارکسی وشیوعەیەتەی کەلەسەدەی ڕابردوودا بەشێکی زۆری وڵاتی گرتبۆووە هەر لەچوار چێوەی حیزب وروناکبیرندا بووە نەك وەك سیستەم وبونێکی کۆمولآیەتی کۆمەڵگای کوردی .

دووەم : بەحوکمی ئەوەی کوردستان وڵاتێکی کۆلۆنیاکراو بووە . بۆیە ئیستعماری ناوەخۆ وەیکردووە کوردستان وەك هەرێمێك لە چاو بەشەکانی دی عێراق ، ئێران ، تورکیا ، سوریا پاشەکەوتووتر بێت و بەگۆڕانی کۆمەلآیەتی سروشتی تێپەر نەبێت ........

جانەوەی پێی دەوترێ " ناسیۆ نالیزمی کوردی " بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە ، دەکرێ ئەوبزاڤە لەچەند قۆناغێك کورت بکەینەوە .

١- قۆناغی ڕوناکبیری کوردی : ئەم قۆناغە مەلا ئەحمەدی خانی ١٦٥٠ – ١٧٠٧ سەرقافلەیەتی و حاجی قادری کۆی ١٨١٧ – ١٨٩٧ تەواو کەری ئەو بزاڤەیە . مەسعودمحمد و جەمال نەبەز و ئەمیری حەسەن پورو هەژاری موکریانی ئەو ڕوناکبیریەی خانی و کۆیی بەدەستپێکی ناسیۆتالیزمی کوردی دادەنێن .

٢- سەرهەڵدانی بنەماڵەکان وەك بنەماڵەی بەدرخانیەکان و بنەماڵەی شێخ عوبیدللا شەمزینی .

٣- بزافی مەشروتیە ی ئێران و مەشروتیەی تورکیا . ئەو دوو بزاڤە دەرفەتێکی چاکیان بۆ کورد ڕێکخست کەرۆناکبیری کورد

وەك فارس وتورکەکان "حیزبی کوردی "دابمەزرێنێت . ئەو قۆناغە، قۆناغی حیزب دروستکردن، بۆتە دەسپێکێك بۆقۆناغی ئایندەی کورد. لەو قۆناغەش روناکبیرانی هەردوو بنەماڵەی بەدرخان وشەمزینی دەورێکی سەرەکییان بینیوە لەدروست کردنی ڕێکخراو و حیزب و کۆمەڵەی رۆشنبیری ودەرکردنی ڕۆژنامە وگۆڤار .

٤- حوکمداریەتی شێخ محمود .

٥- سەرهەڵدانی مارکسیەت هەرچەندە هەرزوو ئەو تەرزە فیکرە لەگەڵ عبدللە جودت هاتۆتە ناوبزافی کوردی یەوە بەلاّم وەك بەرنامە لەعێراق وباشوری کوردستان دروستبونی حیزبی شیوعی بەپلە یەك و"ڕزگاری " و" شۆرشی " "هیوا " بەپلە دوو گۆڕانێکی لەچەمکی ناسیۆنالیزمی کوردیدا دروست کردووە .

٦- دامەزراندنی دیموکراتی کوردستانی ئێران وپارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق .

٧- هەرەسی ئەزمونی تاك حیزبی (پارتی ) لەباشور و(دیموکرات ) لەڕۆژهەلاّت دامەزراندنی پ.ك.ك لەباکور. لەو قۆناغەدا چەندەها حیزبی مارکسی ،قەومی ، ئیسلامی دروست بوون بەلاّم ئەو ئەزمونەش لەگەڵ ڕاوەستانی شەڕی کەنداوی یەکەم ناسراو بە شەڕی عێراق و ئێران لەساڵی ١٩٨٨ دوچاری هەرەسێکی جوزئی بوو .

لەو حەوت قۆناغەدا ناسیۆنالیزمی کوردی زۆری هەر

لـەقۆناغی " ڕزگـاری نیـشتیمانی " دابـووە ، هەرچـی قۆنـاغی هەشتەمە ، قۆناغی پەرلـەمان و حکومـوتی دەسـتوری کوردیـە .
هەندێ نوسەر لەژێر کاریگەری حیزبی ئـەم قۆناغـەش بـە دریـژە پێدەری قۆناغی شەش وحـەوت دادەنـێن بـەڵام لەڕاسـتیدا ، ئـەم قۆناغە . تەحصیلی حاسیلی هەندێ گۆڕانکـاری نێونەتـەوەتی وەك ڕۆخانی مارکسیەت وبلۆکی ڕۆژ هەڵاتی کۆمۆنیستی ، گۆڕانکاری هەرێمی وەك ئاکامەکانی شەڕی کەنـداوی یەکـەم لەسـەر عێـراق وهەرەسی عێراق لەشەڕی کەنداوی دووەم دا ڕزگار کردنی بەشێکی باشوری کوردستان و دروست بوونی بۆشایی سیاسیە لە هەرێم .

## ٢- ناسیۆنالیستەکانی هاوسێ و ناسیۆنالیزمی کوردی

### ١/ ناسیۆنالیزمی تورکی

لەدوای بزاڤی دەسـتورخوازی عوسمـانی ١٩٠٨ ، بـاڵی پـان - تورکیزم کەپێکهاتبولە ( ئەحمد رەزا ، تەلعەت پاشا ، ئەنوەر پاشا ، جەمال پاشا ، دەسـتی لـەباڵی - عوسمـانیزم سـتاند ئـەو باڵـەی تەرەقی تەنیا پەسەندی ڕەگەزی تورکیان دەکرد وبانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە زوو تورکەکان خۆیان لە عەرەب جودا بکەنـەوە . لـەژێر کاریگەری جولەکەی وەك لۆملی وبرنارد لـویس ودەیڤـد کـۆهێن ، تورکەکان وەهمێکیـان بۆخۆیـان دروسـت کردبـوو وەك " ڕەگـەزی تورك لەڕەگەزی هەموو گەلانی تری ڕۆژئاوای چاکترو پاکترە ".

لەسەردەمی کەمالیەکاندا ، کەلوتکەی ناسیۆنالیستی تورکی بوون، تاك و ولاتی تورکیایان لەمێژووی پێنج سەد ساڵەی موسڵمانیتی دابڕی. ئەمەش لەو گروپە چاوەڕێ دەکرا چونکە ئەو بزاڤە لەکۆمەڵگەیەکی نائیسلامی لەدایك ببوو زێدی دەرەوەی بزاڤەکە فەرەنسا بوو لەناوەوەشی ناوچەی سلانیکی جولەکەنشین بوو . تورکەکان زۆر باوەڕیان بەئەزمونی ناسیۆنالیزمی فەڕەنسی وئیتالی وئەڵمانی هەبوو . ئەوبزاڤانەش تەواو دژە دین بوون . هەر لەو ڕوانگەوە مەرجی سەرەکی بەریتانیا وفەڕەنسا هەڵوەشاندنەوەی " خەلافەتی ئیسلامی " بوو . لەئاکام ساڵی ١٩٢٣ کەمالیەکان یەکەم دەولەتی قەومی عەلمانیان لەتورکیا دامەزراند لەساڵی ١٩٢٤ خەلافەتی ئیسلامیان هەڵوەشاندەوە ئەلف بایی عەرەبیان ڕەتکردەوە و ئەلف بایی لاتینیان سەپاند .

ناسیۆنالیزمی تورکی هەتا دەرکەوتنی حیزبی ڕەفا تەواو دژە ئیسلام بوو . ئەو ئەزمونەی تورکیا هەتا کۆتایی ساڵانی هەشتاو بەراییەکانی نەوەد درێژەی کێشا ، ئەویش هەروەك چۆن " ناسیۆنالیزمی ستالین بەپەیڕەوی مارکسیەت " هەرەسی هێنا ئەویش هەرەسی هێنا ، بەلام لەحیزبی رەفاوە هەتا جیزبەکەی ئەردوگان تورکەکان جارێکی تر ناچاربوون ئاوڕ لەئیسلام بدەنەوە بەو ئەزمونەش دووسێ جار توانیان دەسەلاتی حکومەت لەناسیۆنالیزمی قەومی بستێنن . ئەو بیرۆکە ناسیۆنالتی

ئیمپریالیە چونکە لەسەر بنەمایەکی ڕەگەزی دامەزراوە هەر بەڕوخانی ریفۆرم دەکرێ نەك بەتەعدیلکردنی ڕواڵەتی . سەبارەت بەکوردی باکور هیچ گۆڕانێکی نەوعی لەدەسەلاتی (قەومی عەلمانی ) . ( قەومی ئیسلامی ) ڕوی نەداوە ڕووش نادات چونکە ئەو تەوزە بیە لەڕاژەی مرۆڤایەتی مرۆڤ دانی یە .

## ٢- ناسیۆنالیزمی عەرەب

هیچ نەتەوەیەك بەقەد عەرەب سودی لەئیسلام وەرنەگرتووە . لەڕووی شارستانیەوە نەتەوە نەبووە بەقەد عەرەب پاشکەوتوترو پرکێشەتر بەلاّم بەئیسلام بوونە باشترین نەتەوە نەك لەڕووی ڕەگەزەوە بەلکو لەڕووی ئینسانیەوە . بەڕووخانی ئەمپراتوریەتی عەبلسی عەرەب توشی چەندەها پاشاگەردانی سیاسی وکۆمەلاّیەتی ورۆشنبیری بوون . ئەو هەموو پاشاگەردانیەش ژێدەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەلگەڕانەوەی دەسەلاتی عەرەبی لەئیسلام و خودانە عەرەب پەسەندی ودنیا ویستی سەرانی عەرەب.

بەلاوازی ئەمپراتوریەتی عوسمانیش ، رۆژ هەلاّتناسی و مسیونیزەکان هەروەك چۆن تورکەکانیان هاندا پەیرەوی ناسیۆنالیزم بکەن بەهەمان شێوەش عەرەبەکانیان هاندا کەلەدژی دەسەلاّتی عوسمانی شۆرش بەرپا بکەن . کەسانی وەك لۆرانس

وژەنیوال لۆرد ئەلنبی دەوری سەرەکیان بینی لەوروژاندنی هەستی عەرەبێتی وهاندانی سەرانی عەرەب لەدژی خەلافەتی ئیسلامی.
لۆرد ئەلنبی خۆی دەنوسێ : ئەگەر یارمەتی سوپایی عەرەب وکرێکارە عەرەبەکان نەبووایە ، نەماندەتوانی سەرکەوتن بەسەر دەوڵەتی عوسمانی بەدەست بێنن "بەحوکمی ئەوەی عەرەب خۆیان (بەزەنی خۆیان ) بەمیراتگری رەسەنی ئسلام دەزانن ، بۆیە هەتا بزاڤی ئیسلامی غەیرە عەرەبییشیان زۆر پێ قەبوڵ نیە. سەبارەت بە سیاسەتکردنی عەرەبێتیش ئەوە عەرەبە نەسرانیەکانی سوریا ولوبنان لەلایەك و ئەو عەرەبانەی کە لەزانکۆی ئەمریکی لەبیروت دەیانخوێند ، هەروەها ئەو عەرەبانەی لەقوتابخانەی تەبشیریەکانی سوریا ولوبنان ومصر پێگەیشت بوون بزوێنەری ناسیۆنالیزمی عەرەبی بوون . لێرەدا بەپێچەوانەی تورکەکان ، عەرەبەکان زیاتر پەسەندی ناسیۆنالیزمێکی روکەشکراو بەئیسلامیان پەسند کرد.
ئەمەش پەیوەست بوو بەو کەلتورە پڕ سەروەریەی یەی عەرەب لەمێژووی ئیسلامدا هەروەها لەنیشتیمانی عەرەبیدا سێ شوێن زۆر پیرۆز هەن وەك مەکەو مەدینە وقودس . لەوپێودانگەوە گوتاری ناسیۆنالیستی عەرەبی لە"شەریفە حوسێنەوە" تاکو "سەدام حوسێن" گوتارێکی "نیفاقی دینی" پێوەیە . هەرچەندە ئەو گروپە ناسیۆنالیستە تەواو دژ بەدینن . سەدام حوسێن زۆربەی سەرانی ئیخوانی موسلیمین – عێراقی لەناو برد یان زیندان کرد،

ئەسەد ئەوەی لەدەستی هات دژی موسڵمانەکانی سوریا بەکاریهێنا . لەمیصریش دەسەلاتی عەرەبی هەردوو رۆناکبیری عەرەبی " حەسەن بەنا " و " سەید قوتب " یان کوشت . ناسیۆنالیستی عەرەبی ئەوە هەلوێستی بوو لەبەرامبەر " موعارەزەی عەرەبی " ئەدی لەنیشتیمانی عەرەبی ئەو زومرەیە توندترین سیاسەتیان لەبەرامبەر " موعارەزەی غەیرە عەرەبی " بەکارهێناوە : کورد ، ئەمازیغی و قوبتی بەشی هەرە زۆر یان لەو ستەمە قەومی ودینی بەرکەوتووە.

## ٣- ناسیۆنالیزمی فارسی

فارسەکان لەدوای ڕوخاندنی ئەمپراتۆریەتی میدی — کوردی خۆیان بەخاوەنی یەکەمی هەر شارستانیەکی (ئاریان ) دادەنێن . چۆن عەرەب بەئاسانی نەبوو نەموسلمان هەتا هەرسێ شەڕە دێرینەکەیان : (بەدر )و (ئوحد) و(خەندەق) و ( ئەحزاب) لەگەڵ ئیسلام نەکرد ، فارسەکانیش هەتا شەڕی (نەهاوەند) و (مدائین) و (قادسیە) هتد... لەگەڵ ئیسلام نەکرد نەبوونە موسڵمان. چونکە ئەو شەڕانە لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب بوون ، بۆیە کە بوونە موسلمانیش دینێکیان هەلبژارد کە لە مێژوودا ناسراوە بە (شیعە ) ئەوشیعانەش بوونە دوژمنی سەرسەختی عومەر هەتا عومەریشیان شەهید کرد . ئەو کەلتورو

مێـژوو وشارسـتانیەی ئێـران فارسـەکانی ئێـران هـەردەم خۆیـان بەسـاحێب دادەنـێن . لەهـەموو قۆناغـەکانی دەسـەلاٚتی فارسـی (سەفەوی) و(قاجـاری) و(پادشـایی) و(ئیـسلامـی) مەزهەبیـەت ڕوالەتێکی سەرەکی ئەو دەسـەلاٚتە بـووە . هەنـدێ باوەڕیـان وایـە کەفارسەکان لەسەردەمی رەزا شایی پەهلەوی بەدروستی لەسـالٚی ١٩٢٥ دەولـەتێکی قـەومییان دامەزرانـدووە بـەلاٚم لەڕاسـتیدا سەفەویەکانیش هـەر ناسیۆنالیـست و مـەزهـەبی بـوون ، شـەڕی چـالٚدێرانیش هـەر تـەنها شـەڕێکی مەزهـەبی نـەبووە ، بـەلٚکو شەڕێکی قـەومیش بـوو . هـەر لـەدوای ئەوشـەڕەش رۆژ هـەلاٚتی کوردستان بەیەکجاری کەوتە ژێر دەسەلاٚتی سەفەوییەکان.

وشەی "ئێـران" سـەبارەت بەدەسـەلاٚتی فارسـیەوە وشـەیەکی هەلٚخەلٚەتێنەرە . لەنەزەری خۆیان (ئێران) واتە ولاٚتی (فارسـەکان) چونکە هیچ غەیرە فارسێك لەئێران بەقەد فارسێك مافی نی یـە . هەرچی کورد وبلوج وتورکمان وعەجەم هەیە لەدەستوری دەولـەتی ئێستاش وەك نەتەوەیەکی جیا لەفارس پێناسەیەکیان بـۆ نـەکراوە بەلٚکو هەریەکە بە (هاولاٚتیەکی ) ئێرانی دانـراون . رەگەزنامـەی ئێرانی ـــش بەواتای ڕەگەزنامەی فارس دێ بۆیە ئەگـەر کـچێکی فارسی شوو بەغەیرە ئێرانیەك بکات هـەتا لـەئێرانیش دابنیـشێ قەت ڕەگەزنامەی ئێرانـی نادەنـە پیاوەکـە بـەلٚکو هـەر حـسێبی (غەوارە )ی بۆدەکەن !

ئـەم جـۆرە ناسـیـۆنالیزمـە کـە ناسـیـۆنالیزمێکی مـەزهەبیـشە لەگەڵ هەردوو ناسیۆنالیزمی تـورکی وعـەرەبی ، ناسـیـۆنالیزمی ناسروشتین. سەرانی ئـەو سـێ ناسـیـۆنالیزمە لەسـەر بنەمایـەکی کۆلۆنیالیستی دامەزراون وهیچ رەگێکی مـەدەنی وئینـسانی لـەو سێ ناسیۆنالیزمە دانین هەتا ئێستاش لەقەلەمڕەوی دەسـەڵاتیاندا نەتەوەی خۆیان بە باڵادەست وزۆر بـەرزوو پـیرۆز دادەنـێن هەرچـی نەتەوەکانی تری ولاتەکەن بەهاولاتی پلەدووسێ دادەنێن ، هەربۆیە د. اسماعیل بێشکـچی دەنووسـێ ئەوانـەی دوژمنکـارن وسروشـتی بزوتنەوەکانیان ناوەڕۆکێکی ئیمپریالیستی ئیستعماریان هەیە.

## ٤- ناسیۆنالیزمی جولەکە

هەرچـەندە جولەکـە هاوسـێی کـورد نـین بـەلاّم لەمێـژوودا ماوەیـەکی زۆر لەکوردسـتان وتورکیـا وئێـران ژیـاون . ئـەو ناسیۆنالیزمە بەڕوالەت وئەدگارێکی تایبەتی هەیە . لەگـەڵ هـی ناسیۆنالیزمێکی تردا بەراورد نـاکرێ .ئـەو ناسـیـۆنالیزمە زیـاتر لەسەر بنەمایی دین دامەزراوە نەك نەتـەوەیی . ڕاسـتە ئیـسرائیل دەوڵەتێکی قەومی، دینیـیە بـەلاّم رەگـەزی جولەکـە فرەرەگـەزە . جولەکە هەیە کوردە ، عەرەبە، ڕووسییە، پۆلەندیە ، مەغریبیـە، ئینگلیزیە ، فەرەنسی یە. ئەمانە ئەوەی کۆیان دەکاتەوە دینە نـەك تەنها نەتەوە . نەتـەوە لەنـەزەر ئـەوان " ئومەیـە" خۆشیان وەك

له قورئاندا هاتووه به" شعب الله المختار " دادەنێن .

ناسیۆنالیزمی جولەکە لەوە بە ناسیۆنالیزمی عـەرەب و تورکی وفارس دەچێ کە بنەمایەکی ئیمپریالیستی ئیستعماری هەیە. بەلاَم ئەوان بەوە لەدەسەلاَتی ناسیۆنالیستی عـەرەب وتورکی، فارس جیا دەکرێتەوە (قەوم ) و( دین )ی خۆیـان بەسەر کەس داناسەپێنن هەروەها شەڕی ئەوان لەگەلّ عـەرەب شـەڕێکی دینییە نەك قەومی . بە واتای کەئەوان بانگاشەی (دین) دەکەن. ئیشیش بە(دین ) دەکەن هەرچی هەرسێ ناسیۆنالیزمە کەی تـرن نەئیسلامینە نەعەلمانینە .کورد واتەنی لەسەر هیچ دینێك نین!!

## ٥- ناسیۆنالیزمی کوردی

نـاتوانین ناسـیۆنالیزمی کـوردی بـەپێوەری هـیچ کـام لـەو ناسیۆنالیزمانە شرۆڤە بکەین چونکە ئەم ناسـیۆنالیزمە نەتـەواو ناسیۆنالیزمیەکی نەتەوەیی‌وەیە ناسیۆنالیزمێکی دینی یە یـاخود مەزهەبیە. لە سەردەمی رۆناکبیرانی وەك (خانی ) و(حاجی قادری کۆیە ) فۆرم و ناوەڕۆکی ئەم ناسیۆنالیزمە ڕۆحێکی دین ئاراستەی دەکرد. راپەرینەکانی شێخ عوبیدوللاّی نەهری وشێخ محمود وشێخ سـەعید وبـارزان تارێژەیـەکی زۆر لەسـەر ئـەم شـێوازە بـووە. راپەرینەکەی دەرسیم ١٩٣٦- ١٩٣٨ وێرای مەسـەلە قەومیەکە، ئەگەر و فاکتەری مەزهەبی (عەلەوی)یش لە پشت ئەو راپەرینەوە

بوو. ئەو جۆرە ناسیۆنالیزمە پەیوەست بەعەقلیەت وبزوێنەری سەرکردەکانی ئەو ڕاپەرینە بووە کە زۆربەی هەرەزۆری سەید شێخ یان مەلا بوونە وزۆربەی کۆمەڵی کوردەواریش ئەوسا گوێڕایەڵی ئەو زاتە شۆڕشگێرانە بوون .

لە قۆناغی دەسەلاتی تاکلایەنی پارتیش ۱۹٥۸-۱۹۷٥ بە حوکمی ئەوەی سەرکردایەتی لەدەست مەلا مستەفای بارزانی بوو، هەرچەندە زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی مارکسیش بوون، بەلام خەڵك زیاتر لەگەڵ بەرەی مەلا مستەفا دابوون نەك هیچ بەرەی تر ...... بەواتای خەڵك زیاتر "مەلایی" بوونە نەك "حیزبی" هەرچەندە لەو زەمەنە جەماعەتی "کاژیك " هەبوون بانگاشەی "سەربەخۆیی" و"دەوڵەتی کورد"یان دەکرد، بەلام کاریگەری ئەوانە لەناو خەڵك زۆر سنورداربوو. لە دوای هەرەسی ۱۹۷٥ هەموو حیزبە کوردیەکان تێڕوانینی تریان بۆ ناسیۆنالیزم ودین هەبوو . حیزب نەبوو لەبەرنامەیاندا بەندێك لەسەر (مارکسیزم) لینینزم " ی تێدا نەبێ تەنیا پارتی سۆشیالیستی کورد نەبێ ئەوانە تاڕادەیەکی زۆر زیندووکەرەوەی بەرنامەی (کاژیك) بوون. لە قۆناغی ۱۹۷٦ -۱۹۸٦ حیزبەکان ئەوەندە خەریکی (جیابوونەوە)و( شەڕی یەکتر) بوون نیوئەوەندە خەریکی پرۆژە قەومیەکەی کورد نەبوون، بەلام خۆیان لە هەمان گێژەنی ۱۹۷٥ دۆزیەوە، بەڵکو زیاتریش . ئەو "ناسیۆنالیزمە"

"ناسیۆنالیزمێکی ستالینی " بوو بەهیچ جۆرێ دین لەبەرنامەکەیدا جێی نەدەبۆوە . لەدوای پاشاگەردانیەکەی گەورەترین کارەساتی لەدوای خۆی بەجێهێشت لەسەردەمی دەسەلاتی پەرلەمان و حکومەتیش ۱۹۹۱-۲۰۰٦ ناسیۆنالیزمی کورد دەسەلاتدار فۆتۆکۆپیەکی دروستی ناسیۆنالیزمی تورکی وعەرەبی یە . عەرەبەکان ئەوە سەدەیەك زیاترە نەوە لەدوای نەوە بە"عروبە" فرچك دەدەن کەچی تاکی عەرەب ئەوەندە لەدەسەلاتی عەرەبی بێزارە (چونکە هیچی نیە ) لەگێژەیەك دەژی هەر پێلاوەکەی بەولاتەکەیەوە دەیبەستێتەوە . ئەمرۆ سەدەیەك زیاترە شتێك نیە پێ بوەترێ (بەرهەمی عروبە!) غەیرە مالوێرانی قەومی ، دینی ، کەلتوری و رۆشنبیری وئابوری ! تەرکەکانیش ئەوە سەدەیەکە خۆیان لەئیسلام دابڕیوە و هەموو خەمیان ئەوەیە " لەبازاڕی یەکێتی ئەوروپی " وەربگیرێن . ئەو تورکیایەی بەشێکی ئەوروپای لەژێر دەست بوو ئەمرۆ لەئەوروپا حسێبی دەولەتێکی بچووکی ئەوروپی بۆناکەن !!!

ناسیۆنالیزمی نوێی کوردیش خۆی لە حکومەتێکی حیزبیدا مۆلداوە ناوێرێت خەون بەدەولەتێکی بچوکی کوردیش تەنیا لەباشوری ولاتەوە ببینێت ! ئەگەر مەسەلە دەولەت بێت ئەوە عەرەب زیاتر لەبیست دەولەتیان هەیە کەچی رۆناکبیری عەرەبی یان لەهەندەران لەکەلتورێکی دوورە کەلتوری خۆی ژیان

دەگۆزەرێنی یان ئەوەتە لەزیندانە...

ئەوەی تر کە لەوولاّت دەژین ئەوە "ڕۆناکبیری حیزبن نەک ولاّت ومیللەت" ئەو تورکیایەیی کەبانگەشەی دیموکراسیەت دەکات هەموو لیبرالیەکەی بەرگەی ڕایەکانی بێشکچی ناگرێ !ناسیۆنالیزمی کوردیش هێشتا نەیتوانیوە لەچوار چێوەی ئەزموونی عەقلیەتی ناسیۆنالیستی عەرەبی وتورکی دەربچێ . گەورەترین نەهامەتی ئەو ناسیۆنالیزمە (بێ بەرنامەیی) (بێ پرۆژەیی)"یە .

ئەو ئەزمونە فۆتۆکۆپیە گوتارەکەشی هەر لەگوتارەکەی ناسیۆنالیزمی عەرەب وتورکی دەچێت – ئاگای لەوە نیە زەمەنی ئەوە بەسەر چوو هەرچی (حیزب ) پیبلێ ڕاست بێ و بێ بیرکردنەوە وتێڕامان خەڵك وەربگرێ . ئەو نەوەیەی ئێستا ئەوەندە قێزی لەو گوتارە دەبێتەوە کە ئیرادەی دەدزێ و مێشکی لەقالب دەدا ، بۆیە دەیەوێ لە "تەلیسمی تەلقین"دەربچێ و متەلەقیەکی ئاکتیف بێ وتوانای خودی هەبێ ڕەخنە لەهەموو شتێ بگرێ . ئەو نەوەیەش هەر حیزب بە ئەزموونی تاڵی خۆی دروستی کرد ، حیزب دەزانێ "هێشتا ساواین "و " چوار دەورەمان دوژمنە " هێشتا کاری خۆی دەکات !! ئەو گوتارە وەهمیە هەر خۆی خۆی هەلوەشاندەوە هەرووەك چۆن لەعەرەبستان وتورکیا وهەڵوەشایەوە!

## ٢- ڕیفۆرمی ناسیۆنالیسزمی کوردی

لەمێــژوودا هــیچ ناســیۆنالیزمێك لەغــەیری نەهامــەتی و کارەسات هیچی تری بۆ نەتەوە و وڵاتەکەی نەهێناوە. هەروەها ئەو بزاڤــە بۆتــە کارەســات بەســەر هاوسێکانیــشیدا . ئەوەتــە ناسیۆنالیزمی ئەڵمانی کەخۆی لە" نازیەت " و" عەقڵی هیتلەر " دا دەدیت چ کارەساتێکی بەسەر ئەڵمانیا و بەشێکی زۆری ئــەوروپا ودەوروبەری ئەوروپا هێناوە . بەهەمان شێوە ناسیۆنالیزمی ئیتــالی فاشیەت ومۆسۆلینی چ نگبەتیەك و پاشەگەر دانیــەکی دووچــاری ئیتالیا کرد .

لەمــەدا دەردەکــەوێ کەناســیۆنالیزمی واتــای " خۆشەویــستی ودابینکردنــی خۆشــگوزەرانی نەتــەوە ناگــەینێ وەك ســەرانی بانگەشەی بۆدەکەن ، بەڵکو لەخشتەبردنی تاکــەکانی نەتەوەیــە . هەروەها ناسیۆنالیزم نەك بزاڤێکی ئینسانی نیە ، بەڵکو لەکــەدار کــردن وپێــشلکردنی حورمــەت و ڕێــزو مــافی هــەر مرۆڤێکــە . لەهەمووش گرینگتر ، ناسیۆنالیزم بەربەستێکە لە بەرامبەر هــەر پێشکەوتن و ڤەژینێکی شارستانی وژیاری!

وێرای ئەمانەش ناسیۆنالیزم پاڵنەرێکی سەرەکی ئیمپریالیزمــە ئەوەتە ئەوروپیەکان چیان بەسەر گەلانی ئاسیاو ئــەفریقیا هێنــا . هەندێ " جاش قەڵەم " ئەو هــەموو داگیرکردنانــە بەپێویــستیەکی مێژوویی دادەنێن و هەروەها بانگاشەی ئەوە دەکەن کە داگیرکردنی

مصرو جەزائیر مەغریب و لیبیا لەلایەن ئینگلیز و فەڕەنسا کاریگەرێکی پۆزەتقی لەسەر ڕەوشی سیاسی و کۆمەلایەتی شارەکانی عەرەب و عەقڵیەتی روناکبیری عەرەب هەبووە !!

لە ڕاستیدا ئەو داگیرکاریانە بێجگە لە دروستکردنی هەندێ عەرەبی عەقڵ ئیستعماری و وێرانکردنی هەموو تایبەتمەندیەکی کلتوری ئەو ولاٌتانە هیچی تری لێنەکەوتەوە .

ئەوروپیەکان لەژێر کاریگەری مرۆڤسالاری دەستبەرداری ئەو بیرە نامۆیە بوونە مەگەر لەچەند ولاتێکی ئەلمانی وفەڕەنسی و ئینگلیزی نەبێ !! ئەوانە کەخۆیان لەو عەقلیەتە رزگار کرد توانیان ڕووی رەشی باپیرانیان بەچەندەها پرۆژەی ئینسانی سپی بکەنەوە !

لە سایەیی " تورکایەتی " چ میللەتێك بەقەد تورك پاشکەوتوترە ؟ کەمالیەکان ئەوە سەدەیەکە وای لەتاکی تورك کردووە کە جگە لەتورکی گرینگی بەچیتر نەدەن . هەموو شتێ لەتورکیا بە تورکی یە! هەمور فیلمەکان دەبلەجەی تورکی دەکرێ بۆیە هیچ کەنالێك بۆ فێربوونی زمانێکی غەیرە تورکی لەتورکیا دانیە لەئێران و تورکیا هەتا پسپۆڕەکانی بواری پزیشکی ئینگلیزی باش نازانن. ئەوانە چونکە خویان بەو خۆپەسەندیە گرتووە بۆیە هەتا تەیارە ئیسلامیە دەسەلاٌتدارەکەی، کەخۆی لە حیزبەکەی ئەردوگان دەنوێنێ ناتوانێ وەك ئیسلامیەکی تەواو

مامەڵـە لەگـەڵ کـورد بکـات . ئـەوان خۆیـان بـەریفرۆمێکی ناسیۆنالیزمی دادەنێن بـەلاّم جگـە لەڕووکەشکردنی تورکایـەتی بەئیسلام چیتر نییـە ...... ئەگـەر پاساوی ئـەوان بـۆ ( PPK ) مارکسیەتەکەیەتی ئەوا خۆسێ بەشی خەڵکی باکوری کوردستان تەواو پەیرەوی ئیسلام دەکەن؟! خودی مەسەلەکە ئەوەیە تورکەکان ناتوانن خۆیان لەدیوەزمەی تورکایـەتی رزگـار بکـەن . هـەر ئـەو خۆرزگـار نەکرنەیـە بۆتـە هۆکـار و پاسـاوێك بـۆ ئەوروپیـەکان کەتورکیا لەیەکێتی ئەوروپا وەرنەگرن !

هەتا دەسەلاّتی تورك بەو عەقلیەتە بیر بکاتەوە ئەوە سەدەیەکی تریش لەبازنەی بۆش دەسورێتەوە . ئاکـامیش مەرگەسـات بەشـی تاکی تـورك وکـورد دەبێـت . ناسـیۆنالیزمی عـەرەب هـەتا ئـەو سەرکردانەی لەدەسەلاّت بن ، چـاوەڕێی هـیچ ڕیفرۆمێکـی جـدی لێناکرێ چونکە دەسەلاّت وعروبە بۆتـە عـەقلیـەت، عـەقلیـەتیش بەئاسانی ناگۆردرێ . سەرانی ناسیۆنالیستی عەرەب لـە ٩٩,٩٩٪ کەمتر رازی نین سەیر لـەوە دایـە جـاش قەلەمـەکانی نیـشتمانی عەرەب ئەمە بەخۆشەویـستی خـەڵك بـۆ دەسـەلاّت لێکدەدەنـەوە نازانن ئەوە هەردەسەلاّت خۆیەتی ئـەو ژمارەیـە بـۆ سـەرۆکەکەی دادەنێ . جا ئەگەر ئەمە فیرعەونیەت نـەبێ چیـە ، چـونکە هـیچ پێغەمبەرێك لەناو گەلەکەیدا هەرگیز ئـەو ڕێژەیـەی نـەهێناوە ! هەروەك بەناو زیاتر میلیارێك " موسـڵمان " هەیـە ئایـا خـوای

گەورە و دادوەرو کاربەجێ لەو میلیار " موسلمانە " چەند دەنگ دەهێنێ ؟! باوەڕ ناکەم نیو میلیار موسلمان لەخوا ڕازی بێت ! ئەگەر ڕازی بێ دەبێ بەرنامەی خوا بالاّ دەست بێ ئەمڕۆ لەچەند وولاتێکی عەرەب بەرنامەی خوا کاری پێدەکرێ ؟! ئایا تەنیا نوسینی بڕگەی " ئیسلام ئاینی رەسمی دەولەتە " یان " ئیسلام سەرچاوەیەکی سەرەکی تەشریعی ولاتە " یان " ئیسلام یەکێ لەژێدەرە سەرەکیەکانی یاسای ولاتە " ئەمانە جگە لەخەپاندنی خەلکی سادە هیچی تر نیە !

دەسەلاتی ناسیۆنالیزمی عەرەبی بانگەشەی " ئیسلامەتی " خۆی دەکات ، بەلاّم هەر کۆمەلەو تاکێکی ئیسلامی تەواو پەیڕەوی ئیسلام بکاو هەولبدا خەلك بانگ بکا بۆ ئیسلامەتی ئەو دەسەلاتە ئەگەر نەیکوژێ لەزیندان هەموو گیانی دەرزێنێ ! وەك وتمان ، عەرەبایەتی ڕەگێکی لە فیرعەونیەتە جگە لە خۆی کەسی ترنابینێ . لە قەلەمرەویەکەیدا شتێك نیە بەناوی " ئەویتر! " ئەفسوس بەشێك لەو ڕەوتە ئیسلامیەیی عەرەبی چونکە هێشتا خۆی رزگار نەکردووە لەخێوی " عروبە " ، بۆیە لەبەرامبەر مافەکانی کورد زۆر بێ تەسکانە گوتارو رەفتار دەکەن . دەبێ نەزانن کە لەکۆمەلگای ئیسلامیدا هەرگیز شتێك بوونی نیە بەناوی " گەلی سەردەستە " وگەلی ژێر دەستە " هەروەها دەبێ چاك نەزانن کەئەوەی بۆ عەرەبێکی موسلمان هەیە دەبێ هەمان

شتیش بێ جیاوازی گەردێك بۆ كوردی موسڵمانیش هەیە وەبزانم ئەوان هێشتا دەرك بەماهیەتی ئیسلام ناكەن ، بەڵكو زیاتر گرینگی بەهەندێ ئەزمونی تاڵی بەناو ئیسلام لەمێژوودا دەكەن ، بۆیە واچەقبەستوون وئەو سەری تۆنێلەكە بەڕوونی نابینن !!!

هەرچی ناسیۆنالیزمی كوردیە بەشێكی بەناوی " كوردایەتی" كورد نەماوە گێژوو كاسی نەكەن . چۆن جاران هونەر بۆهونەر هەبووە ئەوانەش كوردایەتی لەپێناو كوردایەتی دەكەن نەك پرۆژەیەكی نەتەوەیی ستراتیژیان بۆكورد پێبێت ! باوەڕ ناكەم كەس بەقەد كورد خوێنی لەپێناو " كوردایەتی" دابێ كەچی هەر لەمیر بەدرخانەوە بگرە هەتا ڕاپەرینی ١٩٩١ بەشی كورد هەرپاشا گەردانی بووە . هۆكارەكانی پاشگەردانی زۆر ڕوونن : ڕۆژئاوا + داگیركاران + دەسەڵاتی كوردی خۆی!

لەدوای ڕاپەڕین ئومێدێكی زۆر لای تاكی كورد دروست بوو بەوەی حكومەتێكی مەدەنی كوردی دامەزرا ! بەڵام بەحوكمی ئەوەی ئەوانەی حكومیەتیان بەڕێوە دەبرد هەر بەعەقڵی چیا مامەڵەیان لەگەڵ ئەو دەزگا مەدەنیە كرد بۆیە نسكۆ لەدوای نسكۆ و بێ ئومێدی ڕووی لەتاكی كورد كرد . دەسەڵاتی قۆرخ كرا بۆ بابای حیزبی ناشایستە زۆربەی شوێنە شیاوەكانی دەسەڵاتی مەدەنی لەپەرلەمان و حكومەت و زانكۆ بەكەسانی حیزبی پڕكرانەوە ، خەریكە دام ودەزگاكانمان بەدەردی دام ودەزگاكانی

سەردەمی رژێم دەچن .گەنجێکی زۆر ئەوە پازدە ساڵە بەرەو رووی مەرگی حەتمی دەبێتەوە بۆ ئەوەی بەس رزگار بێ لەفەزای دەسەلاتی ناسیۆنالیزمی کوردی !!

ئایا دەسەلاتی کوردیش دەتوانن وەك رۆژئاوا ییەکان رزگار یان بێت لە خێوی "ناسیۆنالیزمی " وپرۆژەیەکی حەزاری ئینسانی پێشکەش بەکورد بکەن یان هەروەك عەرەب وتورك وهەر لەبازنەی بۆش دەسورێنەوە ؟!

ئەوە باخۆیان بەکردەوە نەك بەقسە بەوەلاّم بێن !

بەکورتی خۆم هەمان رای مەلا سەعیدی کوردی کەناسراوە بەشێخ سەعیدی نەورەسیم هەیە دەڵێ :" نزیکەی پانزدە ساڵە من دەیهێنم و دەیبەم و بیرم لای ئەم مەسەلەیەیەو گەیشتومەتە دوونامانجی گرینگ ، لام وایە تەنیا دوو شت چارەنوسی کوردستان دیاری دەکەن ، یەکێتی نەتەوەیی و هۆشیاری ئاینی .... د.جەبار قادر چەند بابەتێکی کوردناسی _ ل١٤

ئەوە رای شێخ سەعید بووە بۆ بەرایی سەدەی بیستەم بەتایبەتی بۆ قۆناغی دوای مەشروتیەتی تورکیا ١٩٠٨ . لەخوێندنەوەی خۆشم بێجگە لەپەسەندکردنی رای شێخ ، ئێمەش لەپاش راپەرین ئەوە پانزدە ساڵە کورد باجی ئەو دووشتە سەرەکیە دەدات کار بۆ یەکێتی نەتەوەیی ناکات... ئەوەی بەو ناوە دەکرا هەر کوردایەتی بۆ کوردایەتیە نەك بۆکورد هەرچی هۆشیاری ئاینی یەکەیە.

لەوەشدا زۆر کلۆلین هەرگیز لەمێژوودا نەمانتوانیوە سوود لە ڕۆحی ئیسلام وەربگرین . دین لەوەی هەبووە تەنیا وەك عادات وعیبادەت وەرمان گرتووە لایەنە سەرەکیەکەمان فەرامۆش کردووە.□

# ناسیونالیزم بەدوای ((دین))دا دەگەڕێ بۆ ئەوەی خۆی پێ پیرۆز بکات

سازدانی: سەنگەر ڕەمزی زراری

ئایین پانتاییەکی گەورەی هەیە لە کۆمەڵگای کوردی و کاریگەری لەسەر هەموو تاکەکان هەیە، جا چ ئەوانەی پابەندبن بەدین و چ ئەوانەش کە پابەند نین پێیەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی قسە لەسەر چەمك و دەلالەتە ئایینییەکان و ڕۆشنبیری ئایینی دەکەن ڕێژەیەکی کەم و ئیلییەتێکی بچووکن، ئەگەر نا ئەوانی دی زۆربەیان بێدەنگن، یان ئەوانەن کە بەرێنماییە دینییەکان و مەسەلە فیقهییەکانەوە خەریکن، هەرچی لایەنە بنەڕەتی و سەرەکییەکەی دینە کە بیروباوەڕو عەقیدەو فیکری دینی دەگرێتەوە، زۆر کەم قسەی لەسەر کراوە. ئێمە لە گۆڤاری (کاروان) هەوڵدەدەین ئەم تەوەرە لەمیانەی چەند گفتوگۆیەکدا بۆ قسەکردن لەسەر ((ئایین لە پەیوەندیدا بەچەند کایەیەکی دیکەوە)) تەرخان بکەین و هەرجارەی شارەزایەکی ئەم بوارە بدوێنین.

**له حەوتەمین گفتوگۆدا (ئایین و ناسیونالیزم) خراوەتە بەرباس و مامۆستا (سەلام ناوخۆش) وەلامی پرسیارەکانی داوەتەوە.**

**+ سەرەتا (ئایین) و (ناسیونالیزم) بەشێوەیەکی گشتی چ خالێکی هاوبەش و چ خالێکی جیاوازیان هەیە؟ چۆن بەراورد لەنێوان ئەم دووانەدا دەکرێ؟**

- جیهانبینی (ئایین) و (ناسیونالیزم ) زۆر لەیەك جودان. ئایین خۆی تەنها هەر (دینداری) ناگەیەنێ، بەڵکو (دینداری) تەنیا بەشێکی ئایین دەگەیەنێ. ئایین خۆی پەیڕەو، ڕێباز، شەریعەت، تقوس و باوەڕ و، هتد دەگرێتەوە. دەکرێ ئایین ئاسمانی بێت وەك ئایینی جوو و گاور و موسوڵمان .. هەروەها دەکرێ(نا-ئاسمانی) بێت، ئەوەتە کە قورئان دەفەرموێ (لكم دينكم ولي دين) ئەوە ساخ دەکاتەوە کە ئایینی قورەیشییەکان ئاسمانی نەبووە هەر لەسەر ئەو شەنگست و بنەما فیکرییە، دەکرێ هەموو هزرێکی سیاسی یاخود سیستەمێکی سیاسی کەبانگەشەی بونیادنانی کۆمەڵگاو تاك لەسەر بنەماکانی دەکات ناوی ئایینی لێ بندرێت، چونکە ئەگەر (بتپەرستی) ئایین بێت بۆچی (مارکسیزم) و (لیبرالیزم).. هتد، ئایین نەبێت؟! هەرچی (ناسیونالیزم)ە: جیهانێکی زۆر بەرتەنگ دەگرێتەوە (نەتەوە) لەبنەما هەرە سەرەکییەکانی (ناسیونالیزم)ە. ئەو تاکرەهەندییەی ناسیونالیزم لەزاتی

خۆیدالەهەڤدژییەکی رەها دەژێت پەسەندکردنی رەگەزێك بەسەر رەگەزێکیدی بەهیچ جۆرێ خوێندنەوەی پۆزەتیڤانەی (ئەویتر) لەخۆ ناگرێ، ئەمەش خۆی لەخۆیدا نەفی کردنی ئەویتر دەگەیەنێ. ئەو توندرەوییەی لە ناسیونالیزم سەرچاوە دەگرێت هیچ پانتاییەك بۆ دایەلۆگ ناهێڵێتەوە. ئەزموونی (نازیزم)و (فاشیزم) و (عەرەبایەتی)و (تورکایەتی) و (فارسایەتی) بەڵگەی کۆنکرێتیین لەسەر (رۆحیەتی نێگەتیڤی)ی ناسیونالیزم .

حەتمەن کەسانێ هەن بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو دیاردەیە لە (ئایین)یش بەرجەستەیە! لێرەدا دوو شتی جیاوازهەن، ئەو (ئایین)ەی ئێمە لێرە گەرەکمانە ئیسلامە -دەقەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام- نەك ئاکارو رەفتاری بەشێك لە موسڵمان و ئەو دەوڵەتانەی مۆرکی ئیسلامییان هەیە-. بەواتایەکی دی، هەروەك چۆن لە زماندا، Competence زانیاری و .performance بەکارهێنانی زانیارییەکانی زمان هەیە، شیمانەی دروستی و نادروستی لێ دەکرێ... ئایین خۆی وەك competence وایە لەهەڵە بەدەرە، ئەوەی هەڵەی لێدەوەشێتەوە رەفتارو کرداری مرۆڤە.. هەرچی بنیاتی ناسیونالیزمە لەیەك کاتدا competence و performance ی وەك یەکە، ئەگەر وانییە بۆچی خۆ عەرەب و تورك و فارس لەگەڵ کورد هاودینن بۆچی قەبووڵی کورد

ناکەن؟!

لەم روانگەیەوە (ئایین) و (ناسیونالیزم) لەهیچ خالێکدا هاوبەش نین، بەلاّم ئەوەی هەڤدژی لەگەلّ چەمکی ئایین بەرپا ناکات(سۆزی نەتەوایەتی)یە، ئەو سۆزە لەهەموو کەسێکدا هەیە، چونکە حالەتێکی رەمەکییە هەموو مرۆڤێك سۆزی بۆ نەتەوەو نیشتیمانەکەی هەیە. ئەو سۆزەیە والەمرۆڤ دەکات ئاسایشی کەسیی و نەتەوەیی و دینی ولاّتەکەی خۆی بپارێزێت. لێرەدا بەحوکمی ئەوەی ئایین - شەریعەت- تقوس و دەولّەتە واری فرە رەنگی و فرە دینی و فرە نەتەوەییە، هەرچی ناسیونالیزمە رەشمالێکە تەنها جێگەی نەتەوەی شێخ و ئاغا و بەگی لێ دەبێتەوە (ئەوانی دی) وەك تورکی ناسیونالیست دەلّێن: دەکرێ تەنها کۆیلەو خولام بن!!

+ هەندێ جار زاراوەی (ناسیونالیزمی ئایینی) بۆ نموونەی وەکو (پاکستان و ئێرلەنداو فەلەستین) بەکار دەهێندرێ، پێت وایە جۆرە ناسیونالیزمێك هەبێ کە لەسەر بنەمای ئایین دابەش بکرێ، ئەگەر ئەم جۆرە دابەشکردنە هەبێ چ مانایەك بۆ نەتەوە دەمێنێتەوە؟

- (ناسیونالیزمی ئایینی) بۆ غەیری (جوولەکایەتی) کۆکردنەوەی دوو دژە، ئەوەندەی دەزانرێ دوو دژ لەیەك بونیاد کۆنابنەوە، بەلاّم هەرچی جوولەکایەتییە لەیەك کاتدا هەم (دین)

دەمێنێتەوە؟!
فەلەستینییەکان چ قەومی بن یاخود ئیسلامی یان شیوعی لەبەرامبەر جوولەکەدا قودس و پیرۆزی قودس، خاڵێکە هیچ گەنگەشەیەك هەڵناگرێ! ئەو سێ رەوتە دەبێ تەواو لەیەك جودا بن، چونکە هەر یەکە فکرێك ئاراستەی دەکات کە هەڤدژە لەگەڵ ئەویدی...

ئەوە(ناسیونالیزم)ە بەدوای(دین) دەگەڕێ بۆ ئەوەی خۆی پیرۆز بکات نەك دین. ئەم مەسەلەیەش رەگێکی دێرینی هەیە: زۆرێك لەمیللەتە دێرینەکان هەر بۆ ئەوەی مێژوو بۆخۆیان دروست بکەن و نەتەوەو زمانیان بەپیرۆز بناسێنن چەندەها ئەفسانەیان داڕشتووە. ئەڵمانەکان باوەڕیان وابووە کە رەگەزی ئەڵمانی رەگەزێکی پیرۆزە، چونکە ئەوان لەبیناکردنی (بورجی بابل) لەدژی خودادا بەشدارییان نەکردووە، ئاشوورییەکان دین و قەوم تێکەڵ دەکەن هەر بۆ ئەوەی لەبەرامبەر هاوسێکانیان وجوودێك بۆخۆیان دروست بکەنەوە، ناسیۆنالیستە عەرەبەکان (عەرەبایەتی) بەبنەمای ئیسلام تێ دەگەن و ئەوەی باوەڕی وانەبێ کە عەرەب رەگەزێکی بەرزی هەیە ئەوە لەشعوبیە دەمار پیسەکانە! ئەوەی عەرەبی خۆش نەوێ ناچێتە بەهەشتەوە زمانی بەهەشت بەعەرەبییە! ئەو جۆرە تێڕوانینە بۆ ئەو میللەتانەی لەڕابردوودا شارستانیەك و مێژوویێکیان هەبووە لە نۆ ستالیژیایەك زیاتر چیدیکە ناگەیەنێ،

ئەگەر ئەوان مەبەستیان سەپاندنی خۆشیان بێ!.

بەکورتی هەروەك چۆن سۆشیالیست، سەرمایەداری یەکدی قبوڵ ناکەن ئەگەر درۆش لەگەڵ یەك بکەن ئەوە ئایین و ناسیونالیزمیش لەغەیری پەیوەندییەکی نیفاقی چی دیکە ناگەیەنێ.

+ بەڕای هیگل (تەنها مافی نەتەوە بەهێزو دەسەڵاتدارەکانە کە بژین و نەتەوە لاوازەکان دەبێ تێکبشکێندرێن)، کارل بیرسۆنیش پێی وایە یاسای (البقا و للأصلح -مانەوە بۆ چاکترینە) یاسایەکی سروشتییە لەپەیوەندی نێوان گەلاندا، ئایا بیروڕای لەمجۆرە وامان لێناکات باوەڕ بەو بۆچوونە بهێنین کە دەڵێت: ناسیونالیزم هۆکارێکە بۆ بەدیهێنانی ئامانجی (پەرتکەو زاڵبە)؟

- هەندێ وا زەن دەبەن کە بیرۆکەی (نەتەوەی باڵادەست) و (نەتەوەی ژێردەست) یەکێ لە دەرئەنجامەکانی شۆڕشی فەرەنسی و ئینگلیز بووە، بەڵام بەر لەو شۆڕشەی ئەورووپاش، باوەڕی وا لەمێژە باو بووە. دیاردەی کۆیلایەتی بەشێکی ئەو جوداییە نەتەوەیی و ئینسانییە دەگەیەنێ. گومان لەوەدا نییە کە ناسیونالیزم زادەی(عەقلی غەربییە) لەسەر بنەمایەکی کۆلۆنیالی دامەزراوە. رۆمانی (رۆبینسن کروزو)ی دانیال دیفۆ کە یەکەم رۆمانی

ئینگلیزییه- ئەو رەگە ناسیونالیزمییەی کۆلۆنییەی لەخۆ گرتووە..(هیگل)یش کە ژیان بەنەتەوەی بالآدەست رەوا دەبینێ مردنیش بۆ نەتەوەی ژێردەست دادەنێ، تەنیا گوزارشت لەعەقڵ و بیرکردنەوەی کۆمەڵگای خۆی دەکات.

رۆژهەلآتییەکان هەر بەو بیرۆکانە گۆشکران بۆیە لەرۆژهەلآتی ناوەڕاستدا هیچ (ریزێك) بۆ غەیری خۆیان دانانێن. کوردو ئەمازیغی و قیبتی و ئەرمەنی باجی ناسیونالیزم دەدەن. ئەوانەی کوردو ئەمازیغی و قیبتی و ئەرمەنی دەچەوسێننەوە دەسەلآتدارە قەومییەکانی تورك و عەرەب و فارسن!

کەدەوترێ ناسیونالیزم هۆکارێکە بۆ بەدیهێنانی ئامانجی (پەرتکە، زالّ دەبی) هەر بیرۆکەی رۆژئاواییەو قەومییەکانی رۆژهەلآت لەئەوان فێربوونە... رۆژئاواییەکان لەشەڕی دینیدا نەیانتوانی تەواوی ولآتی موسلمانان داگیر بکەن، بەلآم بلآوکردنەوەی ناسیونالیزمیان لەجیهانی ئیسلامیدا کردە ئامانجی ستراتیژی هەر کارێکی خۆیان لەرۆژهەلآتدا، توانیان هەر بەیارمەتی عەرەب و تورکەکان ناسیونالیزم لەدەڤەرەکە بلآوبکەنەوەو چەندەها دەولّەتی قەومی نا-دادگەر لەناوچەکەدا دابمەزرێنن. بۆنموونە هەر لەرێگای پەیمانی سایکسبیکۆ و سیڤەر و سانریمۆن و لۆزان، توانیان لەئەرزی واقیعدا دەولّەتی قەومی بسەپێنن، ئاکام کرداری دابەشکردنی کوردستان بۆ چواربەش-ی

لیّ کەوتەوە! ئەو پەرتکردنە هۆکاریکی سەرەکی بوو بۆ ئەوەی هەر یەکە لە ناسیونالیستی عەرەبی و تورکی و فارسی بەسەر بزاڤی رزگاریخوازی کورد زاڵ بیّ... ئەو پەرتکردنە، چونکە سەرەتا بەپاڵپشتی ناسیونالیستی کۆلۆنیالی رۆژئاوایی بوو، نیشیکی وای لەجەستەی کورد مۆڵدا، سەدەیەك دەبیّ هەروا دیت بەنیشتر دەبیّ. بەجۆریّ هەتا لە لای هەندیّ حیزبی کوردییەوە یەکبوونەوە وای لیهاتووە تەنها خەون بیّ!.

**+ رابەرو شۆرشگیڕانی نەتەوەی کورد زۆربەیان پیاوی ئاییني بوون، ئایا ئەمە گرنگی رۆڵی ئاین دەگەیەنیّ لەخەباتی نەتەوەیی گەلی کورد؟**

- ئەدەب و میژووی سیاسی کورد ئەگەر زانایانی ئاینی لیّ دەربینی چی دەمینیتەوە؟! لەبواری ئەدەبدا فەیلەسوف و شاعیریکی وەك (ئەحمەدی خانی) لە مەم و زینەکەیدا تەواوی بیرکردنەوەی رۆژئاوا لەبەرامبەر ناسیونالیزم دا هەڵدەوەشینیتەوە. ئەو لەکاتیکدا (١٦٥٠-١٧٠٥) باس لەکوردایەتی دەکات کەچی هیشتا رۆژئاواییەکان لەقۆناغی دەوڵەتی ئیمپراتۆری دابوون شاکارەکەشی بەرامبەر رۆمیۆو جولییتی ئینگلیزییە! ئەو زاتە زانایەکی ئاینی بووە!! نالی شاعیر، شیعری کوردی هیندە بەرزکرد خستییە ئاستی شیعری فارسی و عەرەبی، ئەو زاتە کە پاڵپشتی میرنشینی بابان بوو، مەلا بوو!، حاجی قادری کۆیی و

مەلای گەورە.. هتد، ئەوانە هەموو مرۆڤی لەخواترس بوون و خەمی نەتەوەی خۆیان دەخوارد بەشیعرەکانیان میللەت و میرەکانیان ئاگادار دەکردەوە!

کام سەرکردەی کورد زانایەکی ئایینی نەبووە؟! بۆچی بەدرێژایی سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم و بیستەم بۆرژواو رۆشنبیری کورد بەبێ زانایان شۆڕشیان پێ نەکراوە؟! هەتا لەململانێی نێوان حیزبەکانیشدا کەسایەتی دینی وەك رەمزێکی کاریگەر خراوەتە روو. حیزبێکی وەك "یەکێتی" کە لەسەرەتا مارکسی و لینینی و لەدوای راپەڕین سۆشیال دیموکرات، ئەگەر هەژمونی دین نەبێ چی وای لێدەکات "شێخ محمود" بکاتە ڕەمزێکی دیتی بۆ حزبەکەی؟! دەکرێ بڵێین ئیسلام فاکتەرێکی شۆڕگێڕی بووە لەبەرامبەر داگیرکردنی کوردستاندا، سەرکردەو شاعیرەکان باوەڕیان بەسەربەخۆیی کوردستان بووە، نەك کوردستان بەشێك بێت لەعێراق و تورکیاو ئێران... بەلام هەرکە بزاڤی کوردیی بە(عەلمانی)کرا بیرۆکەی سەربەخۆیی کوردستان کرا بە خەونی شاعیران!! مارکسیەت ئەو بەلایەبوو پەتای حوکمی زاتی و لامەرکەزیەتی لەناو بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان چاند. ئەمەش هەر بەهۆی رابەستەی مارکسیەکان بەمۆسکۆوە بوو، ئەوان هێندەی مژۆلی خەباتی چینایەتی! یەکریزی پرۆلیتاریابوون هێندە گرنگیان بەدۆزی نەتەوەیی نەدەدا.. بەشێوازێکی دی زانایانی کورد

چ وەك سەركردە یان رۆشنبیر ئالای سەربەخۆییان لەبەرامبەر ناسیونالیزمی عەرەبی و توركی و فارسی بەرزكردبۆوە هەرچی گرووپی (نا-ئایین)ی ناو بزاڤی رزگاریخوازی كوردستان بوو باوەڕیان بەو ئامانجە ستراتیژییە نەبوو، بەڵكو هەموو پێكۆڵیان بۆ پاراستنی (یەكێتی نیشتیمانی) عێراقی و ئێرانی و توركی بوو. لەئاكام بەونبوونی زانایانی ئایینی لەشانۆی سیاسییدا، بیری نەتەوەیی كوردیش تووشی نسكۆیەك بوو تاكو ئەمڕۆش بەتەواوی راست نەبۆتەوە!!

**+ بۆچی سەركردەیەكی وەكو سەلاحەدینی ئەیوبی گرنگییەكی ئەوتۆی بە نەتەوەكەی خۆی نەداوە، ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ كە پیاوانی ئایینی كورد گەلەكەیان فەرامۆش دەكەن و لەسەر حیسابی بیری نەتەوایەتی گرنگی بەبیری ئایینیان دەدەن؟**

- پێم سەیرە كە دەڵێن سەلاحەدین گرنگی بەنەتەوەی خۆی نەداوە!! بۆچی سەلاحەدین كوردایەتی نەكردووەو ئیسلامەتی كردووە؟! لەسەردەمی سەلاحەدیندا ململانێی ئایینی لەئارادابوو، لە لایەكی دیكەش لەهەموو ئەورووپا دەوڵەتێكی نەتەوەیی نەبووە. هەتا سەردەمی رێنیسانس هەر شەرم بوو زمانێكی نەتەوەیی وەك ئینگلیزی، فەرەنسی، سویدی شتی پێ بنووسرێ. لەئەورووپا (لاتین)ی زمانی دین و سیاسەت و ئەدەب و كولتوور بوو! جا

ئەگەر هەموو ئەورووپا نیزامێکی ئیمپراتۆری تۆتالیتاری هەبووبێ هەموو گەلان ناچار کراون بێن شەڕی دینی (خاچپەرستی) لەگەڵ گەلانی رۆژهەلاٌتی ئیسلامی بکەن. لە رۆژهەلاٌتیش هەموو گەلانی موسڵمان لەژێر سایەی خەلافەت دابوون.. سەلاحەدین بەشێکی دەسەلاٌتی خەلافەتی پەیڕەو دەکرد ئەوە سەلاحەدین بوو کوردی بەهەموو جیهانی ئیسلامی و هەتا ئەورووپاش ناساند. وێڕای ئەمەش زانایان و سەرکردەکانی کورد وایانکردووە کە بزاڤێکی فیکری و فیقهی و مێژوویی لەناو کورددا بەرپا بێ. کەسانی وەك سەلاحەدین و، شەهرەزووری و ئیبن ئادەم و ئیبن خەلەکان و ئیبن مستەوفی .. هتد رووی گەشاوەی کورد بوونە لەشارستانیەتی ئیسلامیدا هەموو جیهانی ئیسلامی ناچارن نووسینی ئەو کەسانە بخوێننەوە. ئەرێ ئەمڕۆ تاکە بیریارێکی عەلمانی کورد هەیە لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی یاخود رۆژئاوایی ناسراو بێت؟!

لە لایەکی دی سەلاحەدین هەر سەرۆکی کورد نەبووە، بەڵکو سەرۆکی عەرەب و تورکیش بووە ئەمەش نوختە گۆڕانێکی ستراتیژییە، چونکە لەسەردەمی عەلمانیدا تورك و عەرەب نەك هەر کورد بەسەرۆك قەبووڵ ناکەن، بەڵکو بەمیللەتیشی قەبووڵ ناکەن!

توخوا سەیر نییە ئەمپراتۆرێکی وەك سەلاحەدین واز لەو دەسەلاٌتە فراوانەی بێنێ وپێش سەردەمی خۆی بکەوێ (ئالاٌی کوردایەتی) بەرز بکاتەوە؟

خالێکی دی لەئیجابیاتی سەلاحەدین ئەوەیە وایکردووە کە چەندەها بنەماڵەی ناودار لەمیسرو ئوردن و لوبنان و فەلەستین ناوبانگ دەربکەن، لەقەبە (کوردی)یەکەشیان شانازییەکی دیکەی کوردە بۆ بەئاگاهاتنەوەی عەرەبە شۆفێنییەکان لەمەڕ بوونی کورد و دەوری کورد لەشارستانیەتی رۆژهەڵاتدا.

لە دیدارێکدا "سەڵاحەدین ناسێك"ی ناسیۆنالیستیان ناچار کرد بڵێ: چاکبوو سەڵاحەدین دەوڵەتی کوردی دروست نەکرد، ئەگەر نا هەربەخۆمان لەناومان دەبرد، وەك چۆن هەر بەخۆمان هۆکاری ڕوخانی زۆربەی میرنشینە کوردیەکان بووینە.

+ کورد ئەوەندەی بەدەستی کێشە نەتەوەییەکانەوە (کورد-عەرەب) (کورد-فارس) (کورد- تورك) زەرەری پێکەوتووەو زوڵمی لێکراوە، ئەوەندە بەدەستی کێشەی دینی زوڵمی لێنەکراوە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بیری ناسیونالیزم هەردەم زەرەری لەکورد داوە؟

- ناسیونالیزم بەرنامەیەکی سیاسی یاخود نیزامێکی ئابووری یاخود کۆمەڵایەتی نییە، تاکو کورد بەرەنگاری داگیرکەرەکانی پێ بکا. هەرچوار دەوڵەتی عێراق و سوریا و تورکیا و ئێران، دەوڵەتی عەلمانی شەرقین، ئەوانە تەنانەت ستەم لەتاکەکانی خۆیانیش دەکەن، بۆیە لەبەرامبەر چارەسەرنەکردنی کێشەی کورددا هیچ یەکێ لەو دەوڵەتانە لەرەوشێکی سیاسی ئارام ناژین. ئەمانە هەر

کیشەی قەومییان لەگەڵ کورد نییە، بەڵکو کێشەی مەزهەبی و هەتا دینیشیان لەگەڵ کورد هەیە.

ئەو رەفتارو گوفتارە شۆڤینیانەی ئەو رژێمانە ئیزدیواژیەتێکی لەململانێکەدا دروست کردووە ئەمەش پابەندە بەپاشخانی فیکری هەردوولا، هەروەها ناهۆشیاری بەشێکی تاکەکانی کۆمەڵی کوردی... من باوەڕم وایە گەر هاوسێ داگیرکەرەکانی کورد (مەسیحی) (جو) (هیندۆس) یاخود (بەرەسمی شیوعی) بووان، کورد لەرێگای ململانێی دینییەوە لەمێژ بوو دەوڵەتی هەبوو.

رۆژئاوا هەمیشە بەرژەوەندییەکانی خۆی پێش هەموو شتێ دەخات لەم پێوەدانگەوە بەبڕوای من ئەگەر دەوڵەتێکی وەك دەوڵەتی عوسمانی لەیەك دوو دەوڵەتی داگیرکاری کوردستان هەبووایە رۆژئاوا تەواو پاڵپشتی لەتەیاری عەلمانی کورد دەکرد و شیمانەی ئەوە دەکرا دەوڵەتێك بۆ کورد دروست بکەن.

ئەگەر لەدوای شەڕی چالدێران کوردستان بوو بەدووبەشی سەرەکی نێو قەلەمڕەوی سەفەوی و عوسمانی، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا رێککەوتنەکەی سوڵتان سەلیم و ئیدریس بەدلیسی تەناهییەکی سیاسی لەنێوان میرانی کورد و دەوڵەتی عوسمانی لێکەوتەوە بەجۆرێ هەتا سەرهەڵدانی ناسیونالیزم لەناو دەوڵەتی عوسمانلی دا نەبوو، ئەوەی هەشبوو مسیۆنێرەکان بەرپایانکرد.

لەو پێوەدەنگەوە بەڕای من لادان لەدین بوو سەرانی عەرەب د

تورك و فارسی والیکرد ستەم لەکورد بکەن، شەڕی کوردیش لەگەڵ دەسەلاتی عەرەب و فارس و تورکدا مۆرکێکی دینی هەبووە..! بەلام هەرکە هەردوو بەرە پشتیان لەدین کرد، کێشەکە چوارچێوەیەکی قەومی وەرگرت.

**+ شەڕو ناکۆکییە ناوخۆییەکان بەدرێژایی مێژوو بوونەتە رێگر لەبەردەم گەیشتنی کورد بەئامانجەکانی، ئایا ئەگەر ئینتیمایەکی بەهێزی نەتەوەیی یان ئایینی هەبووایە، دەبووە هۆی تەبایی گەلی کورد، واتا تاچەند هەر یەکە لە(ئایین) و (ناسیونالیزم) هۆکاری باشن بۆ گەیشتنی میللەتێك بەئامانجەکانی؟**

- هەریەکە لەهەستی ئایینی و هەستی نەتەوەیی رۆلی گرنگ دەگێڕن لەبەدیهێنانی ئامانجە ستراتیژییەکانی هەر میللەتێك. ئەگەر ئیسلام نەبووایە عەرەب هەرگیز نەیاندەتوانی نە یەکگرتووبن و نە لەسنووری نیمچەدورگەی عەرەبی دەرچن، بەلام ئیسلام توانی شۆڕشێکی ئیمانی، حەزاری، کەلتووری لەبونیادی بیرکردنەوەی عەرەبدا بخولقێنێ. لەهەندێ ولات دین دەبێتە ناسنامەی قەومی بۆنموونە لەشیشان، بۆسنە، و کشمیر.. لەرابردوو ئەوەندەی مەسیحیەت توانی ئەورووپا بکاتە یەك دەسەلات، ئەمڕۆ بەوهەموو تەکنەلۆژیایەو مونەزیرەوە ئەورووپا نابێتە ئەورووپایەکی یەکگرتوو.. ئەوەی (بوزا) کردی تەواوی شیوعیەتی هەراسان کرد

لەبەردەم بووژاندنەوەی رۆحی بوزا!
ناسیونالیزم ئەو تاقەتەی دینی نییە، چونکە ناسیۆنالیزمی بەرنامەیەکی سیاسی یاخود رۆحی نییە هەروەها بیرۆکەیەکی رەمەکی نییە، کەواتە ناسیۆنالیزم پالپشتێکی رووحی دەوێ و بەتەنیا ناتوانێ چۆك بەباهۆزی بەرامبەری دابنێ.

خودپەسەندی و هەست بەنەتەوەکردن شادەماری ناسیۆنالیزمە جا ئەگەر ئەو ئینتیمایە رۆحییە بۆ نەتەوە لەئارادا نەبێ هیچ بووژانەوەیەکی حەزاری و مەدەنی و کەلتووری بەرپانابێ.

+ گەلانی جیهان زۆربەیان ئایین لەخزمەتی خۆیان بەکاردەهێنن، بۆنموونە بەعسییەکانی عێراق بۆ زولم و زۆرداری و چەوسانەوەی نەتەوەی کورد زاراوەیەکی وەکو (ئەنفال)یان بەکارهێنا تا شەرعیەت بەزوڵمەکەیان بدەن، کورد تا چەند توانیویەتی دین لەخزمەتی نەتەوەیی خۆی بەکاربێنێ؟ ئایا لەم حاڵەتەدا دین ماهیەتی خۆی لەدەست نادات کاتێ میللەتێ دین لەقالب دەدات بۆخۆی؟

- ئیسلام خۆی دینێکی نەتەوەیی نییە و تایبەت نییە بەتەنیا نەتەوەیەك، هیچ نەتەوەیەکیش بەسەر نەتەوەیەکی دی پەسەند ناکات.. بەلاَم کە عەرەبی عەلمانی دێت بەناوی (توکلنا علی الله)و(الانفال) شەڕی کورد دەکات خۆی بەموسڵمان و کورد بەکافر دادەنێ.. ئەمە هەموو کەسێك کە لەدین گەیشتبێ دەزانێ

دین نییە، بەڵکو ناسیۆنالیزمی شۆڤینی عەرەبییە.. هەرچی فارسە کە بەناوی (ئال البیت) شەڕی کورد دەکات گوزارشت لەئیسلام ناکات، بەڵکو تەنیا ئامانجەکانی (شیعەگەری) دەهێنێتە دی! لەهەمووی سەیرتر هەشتا ساڵ زیاترە ئیسلام لەتورکیا لە دەسەڵات لادراوە، کەچی لەشەڕی کورددا عاتیفەی دینی بەکار دێنن بۆیە کە دین لەچوارچێوەی نەتەوەیەك لەقالب درا، هیچ قودسیەتێکی نامێنێ و دەبێتە دینێکی سیاسی ئەو جۆرە دینەش خەتەرێکی جدی لەسەر غەیری خۆی هەیە، چونکە هەرگیز باوەڕی بەوەیدیکە نییە هەروەها مۆرانەیەکی چەند سەرەیەو ڕێگرێکی کۆنکرێتییە لەبەر دەم بووژانەوەی بزاڤی فیکری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیدا. سەرکردایەتی سیاسی کورد شیانی ئەوەی نەبووە دین بکاتە فاکتەری ململانێ لەگەڵ بەرامبەرەکەی خۆیدا.

**+ ئەو دەوڵەتانەی کوردیان بەسەر دابەشکراوە هەموویان موسڵمانن، بەڵام تۆ لەنوسینێکدا زاراوەی (بەناو هاوئاییینی کورد) بەکاردەهێنی، ئایا ئەمە پاساو هێنانەوە نییە بۆ (پاکێتی) دین؟**

- لەم سەردەمەدا (هاوئاییینی) هەر بەزەرەری کورد تەواو بووە چونکە هیچ یەکسانی و هاوکوفی یەك لەپەیوەندییەکان لەئارا نەبوون... داگیرکارانی کورد دینیان بە غەرەزی سیاسی بەکار

هێنــاوه بــەواتای پەیوەســت نــین بەبنــەماکانی دیــن، بــەڵکو بانگەشەکردنیان بـۆ دیـن تـەنیا بـۆ چەواشـەکردنی کـورد بـوو. ئینتیماکەی کوردیش بۆ دین ئینتیمایەکی مەزهەبی و عیبـادەتی بوو نەك وەك بەرنامەیـەکی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و هتد.. ئەو دوو (بەدحاڵی کردن)و (بەدحاڵی بوونـە) لـەدین هـیچ ئاکامێکی پۆزەتیڤی بەدرێژایی سەدەی رابردووەوە لێ نەکەوتۆتەوە.

+ بـەتێڕوانینی جـەنابت ئێـستا لەکوردسـتان ئینتیمـای (نەتەوەیی) یان (ئایینی) بـەهێزترە ، دەرفـەتی گەشـەکردن بۆ کامیان لەبارترە؟

- ئێستا لەکوردستاندا رەوتی ئایینی خەریکە چوارچـێوەیەکی دیکە وەردەگرێ، زێتر جەخت لەسـەر بەمـەدەنیکردنی کۆمـەڵگا و عەقڵەکان دەکات.. هەتا تەیارە جیهادییەکـەش ئـاڵای کوردسـتان هەڵدەکـەن، ئەمــەش گــۆڕانێکی ســتراتیژییە لەبیرکردنـــەوەی عەقلیەتی رەوتی ئایینی لە کوردستاندا.. هـەروەها دەشـێت ئـەو تـەیارە دەسـەڵاتدارە لـەماوەی ئـەو پازدەسـاڵەدا باشـتر بەئـەرکی نەتەوەیی و نیشتیمانی خۆی هەڵبستێ ئەوسا تێڕوانینی شـەقامی کوردی بەجۆرێکی دیکە دەکەوتەوە.

لێـرەدا نـاکرێ بـەوەڵامێکی یەکلاکـەرەوە بڵـێین ئینتیمـای (نەتەوەیی) یان (ئایینی) بەهێزترە، چونکە هیچ کامیان هەنووکە ئاسۆیان روون نییە! ☐

# فاکتەری ئاینی لە خوێندنەوەی کێشەکاندا

ئەمە تەنیا خوێندنەوەیە، بەواتای دەکرێ (ڕاست) بێ بە نـەزەر هەندێ کەسەوە هەروەها لە زەینی هەندێکدا (هەڵە) بێ. ئەوەندەی من دەرکی پێ بکەم و لێی حاڵی بم ئاین لە پەنای زۆر شت دایـە. دەکرێ خوێندنەوەیەکی ئاینی بۆ زۆر شتی کۆن و ئێستا و داهاتوو بکرێ.

ئەوەندەی ئەورووپا لەسەردەمی کەنیسەدا یەکگرتوو بوو، لـەهیچ زەمەنێکدا هێندە یەکگرتوو نەبووە، وێڕای ئەو هەموو ئاژاوانەی کە ئەورووپا چەندەها ساڵ بوو لەنێوی دەگەوزا، هەرکـە لـە دیـدی سەرکردەکانی (دوژمنێکی) دەرەکی بۆ دروست بوو، ئەورووپایان لە بەرەیەکی دینی کۆکردەوە و بەناوی (شەڕی پیرۆز).. هەر ئەو شـەڕە پیرۆزە ئەورووپای لە لەیەکترازانێکی مەزندا ڕزگارکرد.

ئەو خێوە ئەمڕۆش دەسەڵاتی بەسـەر ئـەورووپاوە هەیـە، هەرکـە زلهێزێکـی ئـەورووپی دیاردەیـەکی نـا-ئـەورووپی بـە (ترسـناك و هەڕەشە) دانا، هەر هەموو بە لەبەرچاوگرتنی هەندێ بەرژەوەنـدی لەزێدی نا-ئەورووپیەکە لە بەرەکە کۆدەبنـەوە. هـەموو بوزیـەکانی دنیا بەجیایی قەومیەت و ڕەنگەوە تەعاتوفیان لەگەڵ یەکدا هەیە.

له هەر وڵاتێك بتێکی بوزا بڕوخێنرێ لـە وڵاتـەکانی دی کەسانی تۆمەتبار کراو دەکەونە بەر هەڕەشەی بوزیەکانەوە.

ئەو فاکتەرەی دین کە خۆی لە کۆکردنـەوەی خـەڵك لـە دەوری دۆزێکدا دەدۆزێتـەوە زۆر جێگـای مـشتومڕ نیـە، بـەڵام غەڵـەت حاڵیبوون لەدین هەندێ جار هۆکارێکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی دۆزێك یاخود بزاڤێکی سیاسی!

لێرەدا هەوڵ دەدەین لەم دوو حاڵەتەی دیـن لـە بزاڤـی سیاسـی کوردی بکۆڵینەوە.

کەس ناتوانێ نکووڵی لەوە بکات کە هیچ راپەڕین و شۆڕشێکی کوردی هـەتا هەرەسـهێنانی شۆڕشـی تـەیلول بـەدەر نـەبووە لـە سەروەری دین لە خولقاندن و بەردەوامبوون و هەتا رووخـانی هـەر شۆڕش و راپەڕینێك.

بەرایی پێکەوە گونجانی دەسەڵاتی کـوردی و عوسمـانی کـە بـە کۆششی شێخ ئیدریسی بەدلیسی و سولتان سـەلیم هاتـە ئاراوە، دین بەگشتی و مەزهەب بە تایبەتی رۆڵی سـەرەکی لـەم پێکـەوە ژیانیە بینی. بە گوێرەی رێکەوتنامەی بەدلیسی و سولتان سەلیم کوردسـتانی عوسمـانلی کەوتـە ژێـر دەسـەڵاتی میرەکـانی کـورد. دەسەڵاتی عوسمانی لە کوردستاندا دەسەڵاتێکی لامەرکەزی هەبود. ئەو پەیوەندیەی نێوان میرانی کـورد و دەوڵـەتی عوسمـانلی هـەتا سەدەی نۆزدەهەم درێژەی کێشا. هەرکە دەوڵەتی عوسمـانلی لـەژێر

فشاری رۆژئاوا و مسیۆنێرەکانی ناو ئیمپراتۆریەت لەو لامەرکەزیەتە پەشیمان بۆوە، پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی کوردی و دەوڵەت کە بە زەرەری هەردوولا تەواوبوو. کۆتایی پێهات.

هەروەها دامەزراندنی میرنشینی بەدرخان کە د.ئازاد گەرمیانی بە حکومەتێکی ئیسلامی ناوی دەبات، فاکتەری دین رۆڵی سەرەکی بینی لە گردبوونەوەی کورد لە دەوری ئەو میرنشینەدا. هەر ئەوەش وای لە مسیۆنێرەکان و ئاسوریەکان کرد کێشە بۆ ئەو میرنشینە دروست بکەن!

لە سەرتای سەدەی بیستەمیش، کە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فەرەنسی لەلایەك، کەمالیەکان بە پاڵپشتی سۆڤیەت و ئینگلیز لەلایەکی تر هەم خەلافەتیان هەڵوەشاندەوەو هەمیش لە چارەسەری دۆزی کورد پەشیمان بونەوە تەنیا زانایەکی ئایینی وەك شێخ سەعیدی پیران توانی شۆڕش بەرپا بکات نەك تەیاری عەلمانی رۆناکبیری کورد. لەشۆڕشەکەی شێخ سەعید تەواو خۆیا دەبی کە فاکتەری دین و قەومیەت دینەمۆی هەڵگیرساندنی ئەو شۆڕشە بوونە. هەرچەندە ئەوسا کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان هەبووە، بەڵام نەیانتوانیوە بە رۆحێکی حیزبی کورد لە دژی دەسەڵاتی کەمالیەکان تەیار بکات.

لە بەشی رۆژهەڵاتی کوردستانیش کۆمەڵەی ژێکاف بەو ئەنجامانەی کە هەیبوون نەیانتوانی شۆڕش لە دژی دام و دەزگای

شاهانە بەرپا بکات، بەڵام هەرکـە قـازی موحەمـەدی کەسـایەتی ئایینی ناسـراوی مـەهاباد پەیوەنـدی بـە ژێ‌کافـەوە کـرد تـوانی گۆڕانێکی نەوعی لە چەمکی حیزبیەت دروست بکـاو خـەڵکێکی زۆر لە چواردەورەی حیزب کۆبکاتەوە.

هەر لەسەردەمی قازی محمددا بوو کە حیزب بەشێوەی ڕێکخستن و ئیدارە و حکومەتەوە لەناو کورد دا بەرپابێ. ئێـستاشی لەگـەڵ دابێ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هەر بە حیزبەکەی قـازی محمد دەناسرێ!

لە بەشی باشوری وڵاتیش هێندەی باس لە بنەماڵەی شێخ محمود و مەلا مستەفا دەکرێ، هەندە باس لە دەوری حیزب ناکرێ. خۆ لـە سەردەمی شێخ مـەحمود دا حیزبـی کـوردی هـەبوون، بـەڵام ئـەو حیزبانە بـەبێ سـەرکردەیەکی ئـایینی هـیچ دەورێکـی ئـەوتۆیان نەبووە. لە مەملەکەتی شێخدا هـەر شـێخ خـۆی حکومـەت بـوو، حکومەتیش شێخ بوو، ئەوەو وەنەبێ شێخ مەحمود سیاسەتمەدارێکی گەورە بووبێ و کەسی دی نـەبووبێ شـان لەشـانی بـدات، بـەڵکو مەسەلەکە زیاتر پەیوەست بووە بە کەسایەتی ئایینی شێخەوە.

هەر لە سەردەمی ڕاپەڕینەکانی بارزانـدا، چـەندەها کۆمەڵـەی کوردی هەبوون، لە هەموویان بەهێزتر کۆمەڵەی هیـوا بـوو، ئـەو کۆمەڵەیەش تاقـەتی شـەڕی چەکداری نـەبوو، چـونکە زۆربـەی ئەندامـەکانی ڕۆنـاکبیری شاریی بـوون و حەوسـەڵەی تفـەنگ و

عەقڵی تفەنگیان نەبوو، بۆیە ناچار بوون پەیوەندی بە مەلا مستەفاوە بکەن!

بەڵگەیەکی تر لەسەر رۆڵی فاکتەری دین لە خولقاندن و بەردەوامبوونی شۆڕشدا ئەوەیە کە لە پاش لەسێدارەدانی شێخ سەعیدی پیران و سەید ڕەزای دەرسیمی و قازی محمد و کۆچکردنی شێخ مەحمود و چوونی مەلا مستەفا بۆ سۆڤیەت، هەتا دەرکەوتنەوەی مەلا مستەفا هیچ بزاڤێکی چەکداری لەهیچ پارچەیەکی کوردستاندا بەرپا نەبووە! ئەم گردبوونەوە کوردەوارییە تا ڕادەیەکی زۆر هاوئاهەنگ بووە لەگەڵ بیرکردنەوەو دنیا دیتن و عەقڵیەتی کۆمەڵگەی کوردیەوە. بە واتایەکی تر، ناتوانرێ بەشێوەیەکی ڕەها حوکم لەسەر ماهیەتی ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانە و بەشداری ئەو خەڵکە بە پێوەرێکی ئایینی یاخود (نا-ئایینی) بدرێت، چونکە نە ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانە تەواو ئیسلامی بوون (لەڕووی تیۆر و مەنهەج و ڕەفتار و گوفتاردا)، نە خەڵکەکەش ئەوسا تێڕوانینێکی سیاسی بۆ دین هەبووە، بەڵام بە حوکمی ئەوەی کورد و دەسەڵاتی کوردی موسڵمان بوونە، ئەو موسڵمان بوونە بۆتە فاکتەرێکی سەرەکی ئەو گردبوونەوە لە چواردەوری شۆڕشدا.

دوای شۆڕشی (کلاسیکی) کوردی، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١-١٩٧٥ بوو، ئەو شۆڕشەش تا ڕادەیەکی زۆر درێژەپێدەری شۆڕشە کلاسیکیەکانی دی کوردی بووە، بۆیە هەر کە هەرەسی هێنا،

بەشێکی زۆر لە تەیاری سیکیولاری کوردی بەرەی لە بەرامبەر دین و (کوردایەتی) توندتر کرد، هەر هەمووی خۆی بە (مارکسی) دادەناو حیزب نەبوو —مەگەر پاسۆک نەبێ- لە بەندێکی پلاتفۆرمەکەیدا ئاماژەی بۆ مارکسیەت تێدانەبێ!

ئەو ڕەوتە مارکسیە مێژوویێکی گەشی نیە، چونکە هەر لەگەڵ پەیدابوونیان لە چیادا کەوتنە وێزەی یەکتر بەجۆرێ دەکرێ (شۆڕشی نوێ) بە دەسپێکی شەڕی ناوخۆ دابندرێ!

جا ئەگەر شۆڕشە کلاسیکیەکانی کورد بوونە قوربانی بەرژەوەندیەکانی رۆژئاوا لەلایەك و دەوڵەتە ئەقلیمیەکان لەلایەکی تر، ئەوە (شۆڕشی نوێ) یاخود شۆڕشی دوور لە دینی کوردی، وەك هەرەسی سۆڤیەت و ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی هەرەسی خۆی لە هەناوی خۆی بوو.

با بزانین بۆچی دین لە هەندێ شۆڕشی کوردیدا بۆتە فاکتەری روخانی شۆڕشەکە؟! ئایا بەڕاستی شتێ لە ئیسلام داهەیە کە بانگەشەی نسکۆ و هەرەس لە بەرامبەر هێزێکی دەرەکی دا بکات؟!

ئیسلام شتێکە و دیتن و تێگەیشتنی خەڵك لە ئیسلام شتێکی ترە، ئیسلام یەکێ لەو دینانەیە کە ستەم قەبووڵ ناکات. لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا نەتەوەی باڵادەست و نەتەوەی ژێردەست نیە،

ئەوەی گەلان دراوسێی کورد لە بەرامبەر کورد دەیکەن، ئەوە تەنیا دینی عەقڵی ئەوانە.

هەندێ جار هەر داگیرکەرانی کوردستان لەمەدا بەرپرس نین، بەڵکو ڕەوتی عەلمانی کوردیش بەشێکی ئەو لێکدانەوە نابەجێییەی بەر دەکەوێت. هەر بۆ نموونە مەسەلەی مەلای خەتێ و میری سۆران کراوەتە کەلتورێك بەجۆرێ مەلای خەتێ بۆتە رەمزی خیانەت و میری سۆرانیش بۆتە (سەرکردەی نەتەوەیی!) ئەوانەی باسی روخانی ئەو میرنشینە دەکەن، دین دەکەنە فاکتەری ڕوخانی، بەڵام لەراستیدا دین هیچ ڕۆڵێکی نەبووە، چونکە نە میر ئەو سەرۆکە نەتەوەییە بووە کورد خەمی ڕووخانی بووبێ، نە مەلای خەتێش هیچ فەتوایەکی داوە، بەڵکی ئەوەی قەناعەتی بە میر کرد تەسلیم بێ (ڕیچارد وودی) بەریتانی بووە!!

کێشەی دەسەڵاتی کوردی ئەوە بووە دبلۆمات و سیاسی نەبووە، تەواویش لە ماهیەتی ئیسلام نەگەیشتووە، هەر بۆیە دراوسێکانی زۆر بە ئاسانی بەناوی دینەوە توانیویانە ستەم لە کورد بکەن، باوەڕم وایە ئەگەر کورد دراوسێکانی غەیرەدین یاخود مارکسی بووانە، کورد لەمێژبوو گەورەترین دەوڵەتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبوو، چونکە دەسەڵاتی ئەوسای کوردی دەسەڵاتی غەیری دینی قەبوڵ نەبوو! □

# کوشتنی ئینتما

خۆشویستنی زێد و وڵات خەسڵەتێکی سروشتی هەر مرۆڤێکی سروشتیە، ئەوەتە پێغەمبەری ئیسلام لە بەرامبەر ناچارکردنی بەوەی زێدی بەجێبهێڵێ، دەفەموێ: ئەگەر ناچار نەکرابام بەجێم نەدەهێشتی. هەروەها لەشوێنێکی تر دەفەرموێ: دەزانن هاوەڵینە چۆن ئێمە کێوی ئوحودمان خۆش دەوێ، ئەویش ئاوا ئێمەی خۆشدەوێ..

لەو پێوەدانگەوە تاك و کۆمەڵ و دەسەڵات لە وڵاتدا دەبێ لە فەزایەکی پڕ هارمۆنیدا بژین، چونکە هەرسێك سێ جەستەی (باوەڕێك)ن ئەو باوەڕ و فەلسەفە و عەقڵیەتە هەرسێك تەعبیر لەیەك دەکەن.

لە وڵاتی ئێمەش، مەگەر داغستانیەکان، ئەگەرنا کەس بەقەد کورد وڵاتەکەی خۆش ناوێ، ئەوەتە هەر رۆژنامە و گۆڤار و ناوەندێکی رۆشنبیری، حیزبی دامەزرابێ کوردستانی هەر لەگەڵدا بووە. بە دەیان و سەدان گەنج لەمێژووی پڕ سەروەری کورددا بێ ئەوەی ئینتمای هیچ حزبێکیان هەبووبێت تەنیا لەسەر کوردستان لەدار دراون.

لەقۆناغی بەرراپەڕیندا، بەحوکمی ئەوەی حیزبەکان هەموو لە شاخ بوون، تەواو لەگەڵ ژیانی مەدەنی شار نەدەژیان، پێشمەرگە و سەرکردەکان رەمزی پیرۆز بوون، ئەوەی بەر لە راپەڕین باوەڕی وابوو دەسەلاتی کوردی چارەسەری هەموو کێشە سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووریەکانی کۆمەلگای کوردستانی پێدەکرێ. ئەو تێڕوانینە لەلای هەر تاکێکی کوردی بەبێ ئینتمای حیزبیەوە ببوە هەقیقەتێك، بێگومان زۆر ئەگەر هەبوون ئەو (وەهمەیان لەلای تاکی کورد دروست کردبوو، چونکە لەلایەك بەعس هەردەم مۆتەکەی مەرگ بوو بۆ هەرکەسێك هەستێکی کوردانەی هەبێ، ئەگەر ئەو تاکە کەسێکی دیار بوایە یان بزاڤێکی رۆشنبیری یان سیاسی هەبوایە بێگومان بەشی ئەو کەسە یان زیندان دەبوو یان مەرگی حەتمی. لەلایەکی تریش ئاستی هۆشیاری خەڵك لەو ئاستە نەبوو تەواو ئیستیعابی عەقلیەتی حیزب بکا. هەروەها بەشێکی زۆری بێئاگا بوو لەو ململانێ و شەڕە نەگریسەی نێوان حیزبەکان!

ئەو ئەوەیە بەو ئینتما بێئاگاییەوە ئینتمایەکی موتلەقی بۆ وڵات و بزاڤی کوردی هەبوو، هەرچەندە ئەو ئەوەیە لە نسکۆی ١٩٧٥ تووشی شۆك و هەرەس بوو. لەپاش ئەو هەرەسە زەمەنی تاك حیزبی بەسەر چوو، چەندەها حیزب لەبەر رۆشنایی مارکسیەت لە کوردستان دروست بوون. ئەو فرەحزبیە هەر لە بەرایی مەرگی حیوار و یەکتر قەبوڵکردنی لێبەرپا بوو، چونکە

هەریەکە خۆی بە (نوێنەری شەرعی) خەڵك دادەناو خەڵکیش بەتایبەتی ئەوانەی شار بێئاگا بوو لەو نوێنەرانەی یان ئەوەتا وا تەلقین درابوو کە حیزبەکەی ئەو لەسەر هەقە. ئەو پلورالەتیە Pluralityش تەمەنی هەر بەقەد تەمەنی تاکحیزبی بوو. لەگەڵ ئەو هەرەسەی ١٩٨٨یش، ئەویش وەك ئەزمونی فرەحیزبی شاخ هەرەسی هێنا، بەڵام گیانی ئینتما بۆ وڵات و زێد هەر نەمرد، چونکە ئەوەی دەیویست ئەو ئینتمایە بکوژێ تەنیا رژێم بوو، رژێمیش لەلای هەر کوردێك داگیرکەر بوو...!

راپەڕین کە لە ١٩٩١ بەرپا بوو قۆناغێکی نوێ بوو، نوێ بوو لە هەموو روێکەوە. حیزب و خەڵك تەواو بەیەك ئاشنا بوون! دەسەڵات بووە رژێمێکی کوردی. هەموو شت بووە کوردی، بەڵام نەك لەپێناوی کورد! لە زەمەنی بەرەی کوردستانیدا هەرچی دەکرا خەڵك خۆی پاساوی دەهێنایەوە: ئەزمونەکە نوێیە، ئێمە لە دەسەڵاتی مەدەنی لێڕانەهاتووین، هەموو گەلانی دنیا بەو قۆناغەدا تێپەڕیون. هێشتا خەڵك و حیزب لە چوارچێوەی میلیشیان، میلیشیای حیزب ئیدارە بەڕێوە دەبات، هێشتا ماومانە بۆ ژیانی موئەسەساتی.. ئەمانە هەم قسەی خەڵك بوو هەم دەسەڵاتیش-دەسەڵاتی حیزب- ئاوا ئەندامەکانی تەلقین دەدا، ئەوانیش هەمان شتیان بە زیادەوەش بەرەش و ڕووتی وڵات دەگوت. هەردوو حیزب بە دەسەڵاتی بەرە رازی نەبوون، چونکە لە بەرەدا

هەشت حیزب هەبوون.. ئەوەبوو هەڵبژاردن کرا، بەڵام مەرجی وا دانرا، هەر تەنیا هەردووکیان دەرچوون! هەر لەگەڵ دەرکەوتنی ناکامەکانی هەڵبژاردندا چی نەمابوو هەر لە یەکەم رۆژدا لەسەر کورسیەکی پەرلەمان عەقڵی شاخی زیندوو بکەنەوە.

لە سەردەمی حکومەتی یەکەم و دووەمدا، هەرچەندە هەندێ دام و دەزگا زیندوو کرانەوە، بەڵام عەقڵی میلیشیای نەك هەر لەنێو نەبردرا، بەڵکو بەرگێکی مەدەنی وەبەر کرا.. حیزب هەر خەریکی خۆقەبەکردن و تێرکردنی فەرماندەکانی بوو، حکومەتیش هەر دەیگوت هێشتا ساواین، تازە گاگەڵە دەکەین.. هەر بەپێ بکەوین دەزانین چیتان بۆ دەکەین!! ئەو حکومەتە ساوایە بەرگەی عەقڵی میلیشای حیزبی نەگرت، بۆیە شەڕ لەدوای شەڕ بەرپا بوون.. زمانی حیوار هەر لەپێناوی بەرژەوەندی حیزب بوو.

ئەوە پازدە ساڵە حیزب و حکومەت ئەو قەوانە سواوە لێدەدەن و لێدەدەنەوە. ئەوەندەی من لە سیاسەت بگەم نەك ئەو پازدە ساڵە، دوو پازدە ساڵی تریش هیچ گۆڕانێکی نەوعی لەو عەقڵیەتەی دەسەڵات دروست نابێ چونکە سروشتی هەر حیزبێکی ناسیونالیستی رۆژهەلاتی هەر ئەوەی لێدەکەوێتەوە، زیاتر لە پەنجاساڵە تەیاری ناصری و عەرەفاتی لە میصر و فەلەستین ئەو قەوانە لێدەدەنەوە. ئەمرۆ وەنەبێ وڵاتانی عەرەبی لە مصر و فەلەستین باشتر بن، بۆ نموونە بە حوکمی ئەوەی کەنداویەکان

پارەیەکی ئێجگار زۆریان هەیە، بە پارە دەمی خەڵکیان گرتووە نەگەرنا هەموو کەنداو شەڕی هەر هەفتەیەکی لەگەڵ ڕژێمێکی وەك صدام پێدەکرێ!

لەنێو ئەو ململانێیەی دوای ڕاپەڕین نەوەیەك دروست بوو وەك نەوەی پێشوو نیە بە هەموو دوعایەکی حیزب بڵێ ئامین. بەشێك لەم نەوەیە هێندە لە دەسەڵاتی کوردی بێزارە و سەری خۆی هەڵگرتووە بەرەو هەندەران لەوێش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خەریکی گومکردنی خودی خۆیەتی. لە وڵات هەستی بە نامۆیی دەکرد، لە ئەورووپاش بەشی ئەو تەنیا پارە پەیداکردنە. زۆربەی ئەو گەنجەی لە هەژمەت و حەسرەتی دەسەڵاتی کوردی هەڵاتووە هیچ ئینتمایەکی ڕۆحی و قەومیی بۆ وڵات نەماوە و بە عەقڵ بۆتە غەریبەکی غەوارە! ئەو توانەوەو خۆ ونکردنە لە کەلتوری ڕۆژئاوادا ئەنفالێکی ڕەشە دەرهەق بە ناسنامەی کەلتوری و مرۆیی تاکی کورد دەکرێ و غەیری دەسەڵاتی کوردی کەسی تر لێی بەرپرس نیە. هەروەها لەناو ئەم نەوەیەدا بەشێك لە نەوەی بەر لە ڕاپەڕینیشی تێدایە. ئەوانەش زۆربەی هەرەزۆری پێشمەرگەی حیزب بوونە، بەڵام بە حوکمی ئەوەی حیزب ئێستا لە قۆناغی دەسەڵات و حکومەت دایە و قۆناغی ((ڕزگاریخوازی نیشتمانی)) بریوە پەکی بەوانە نەکەتووە. حیزب ئەمڕۆ فەرمانبەری هەیە بە زەبری پارە ئینتمای

بۆ دروست کردووە هێندە پێویستی بە عـەقلی کـۆنی پێشمەرگە نیە!! ئەوانە زۆری بە حەسرەتەوە سەر ئەنێنەوە.

بەشێکی تـری ئـەم ئەوەیـە نایـەوێ یـان نـەیتوانیوە ولات بەجێبهێلێ.. ئەوەی نـەیتوانیوە ولاتـی بـەجێبهێلێ وەك (مـاغوت) بیردەکاتەوە لە زەنی ئەو راستیە دروست بووە:

کە ئەوەی بە نیشتمانی دەبەستێتەوە تەنیا پێلاوەکانیەتی!

ئەو بێنیشتمابوونە یان خۆ بەریکردنە لە دەسـەلات لـە غـەیری زیادبوونی نەهامەتیەکەی تر بـۆ کـورد وەك نەتـەوە هیـچی تـری لێناکەوێتەوە. دەسەلاتی کوردی هەست بەوە ناکات کە خۆی لـە چ گێژەنەك دەژی و ئەگەر ئـەجارە بقـەومێ وەك قـەرمانی ٧٥ و ٨٨ نابێت!! چونکە لەدوای ئەو دوو هەرەسە گەنج و لاوی کورد هێشتا لە لوتکەی ئینتمادابوو!!

لەوانەیە هەندێ باوەڕیان وابێ، هێشتا حکومەت ساوایە، بۆیـە لەدستی نایەت ئەگەرنا کوردستان دەکەنـە سویـسرا! ئـەم جۆرە توتیەش، چونکە مشەخۆرێکی بەردەوامە، لە بەشێکی زۆری دام و دەزگای ولاتدا پێی خۆی تونـدکردووە بـەجۆرێ وەك یـەکێ لەوانـە وتەنی: "لادانم قیامەت دەقەومێ" خۆی وتەنی بۆ ئەوەی قیامـەت نەقەومێ با هەر لە خەلك بقەومێ..؟!

بەکورتی هۆکاری سەرەکی کوشتنی ئینتما دەسـەلاتی کوردیـە ندك دەسەلاتی هەر داگیرکەرێك. دەسەلاتیش لە ولاتی ئێمە یەعنی

(ینك) و (پدك) ئەوانەش لەدوو هەوێ دەچن کە دەیانەوێ لە هەموو شتێ وەك یەك بن. جا ئەگەر یەکێکیان داوە سپیەکانی سەری پیاوەکە دەربهێنێ، ئەویتر داوە رەشەکان دەربهێنێ ئەوە چۆن کابرا سەری رووتایەوە، کوردستانیش لەنێوان ئەو ململانێیەدا خەریکە بەهەمان دەرد دەچێ. ئەو کاتەش ئێوە هەر ئینتما ناکوژن، بەڵکو مەعریفە و عەقلی مەعریفیش دەکوژن و زانکۆ دەبێتە جەهالەتکۆ و هیچ پەیوەندیەکی رۆحیی و نیشتمانی و هەتا ئینسانیش لەنێوان تاك و دەسەڵات نامێنێ ، عەرەبە چاورەشەکانی پەرلەمان و حکومەتی بەغداش هەر خەریکی خۆ تەیارکردنن، ئەدی ئەوە بەس ئەوە خەریکن پرۆسەی بەجاشکردن دەبوژێننەوە، دەبێ جاش دروستکردنەوە بۆچی بێ؟ شەڕی ئەمریکا یان ئیسرائیلی پێدەکەن؟!. ❑

# دەوڵەتنەبوون لەنێوان گرفت و پاساودا

لەبەردەم کێشە هەنوکەییەکانی ئەمڕۆماندا هەبوون و نەبوونی دەوڵەت دووڕای هەڤدژی لێکەوتۆتەوە. دەبێ هەموو کێشەکانمان لە نەبوونی دەوڵەتەوە سەرچاوەگرتووبێ؟! لەلایەکی دی دەبێ دەوڵەت دارعەساکەی موسابێ و هەموو کێشەکانمان چارەسەر بکات؟!

ئەو سێکوچکەی (دەوڵەت- گرفت- پاساو) خوێندنەوەیەکی دەوێ کە جیابێ لە هەر خوێندنەوەیەکی ئایدیۆلۆژی و حیزبی. با بزانین گرفتی دەسەڵاتی کوردی لەچیدایە. ئایا دەسەڵاتی کوردی ڕەنگدانەوەی هزر و بیرکردنەوەی کۆمەڵگای کوردیە. دەمانێکە کۆمەڵگەی کوردی گیرۆدەی عەقلیەتی خێڵداریە، ئەوەی ئاغا دەیڵێت دەستورە بۆ غەیری ئاغا نەك ئاغا خۆی.

هەر ئەمڕۆش ئەوەی ئاغای مۆدێرن (سەرۆك حیزب) دەیڵێ دەستورە! دەستورە بۆ هەر تاکێك-حیزبی بێ یان نەبێ-، بەلام لە سنوری قەڵەمڕەوی ئەودا بژی.

میەکانی کورد هیچ خوێندنەوەیەکی پۆزەتیڤانەیان بۆ یەکتر نەبووە. هەر ئەو ململانێ ئەزەلییەی ئەوان بوو هەموو تاکی کوردی تووشی پاشاگەردانی و نسکۆ کرد.

لەعێراقدا بەرلەوەی شا فەیسەڵ ببێتە شای عێراق و کوردستان بەعێراقەوە بلکێندرێ، شێخ مەحمود حوکمداری سلێمانی بوو-نەك کوردستان-. عەرەب بە شیعە و سونەوە شافەیسەڵی (ناعێراقی)یان قەبوڵ بوو، بەڵام کورد شێخ مەحمودی قەبوڵ نەبوو. رەفیق حیلمی لە یاداشتەکانیدا دەنووسێ: شێخ لەڕاووشکاری خۆی نەدەکەوت و ئێمەی ڕووناکبیرانیش شەوان خەریکی کەیف و سەیفی خۆمان بووین. با بپرسین بۆچی هەولێر و ڕەواندز و بەهدینان شێخ مەحمودی قەبوڵ نەبوو؟! لەبەر ئەوەی خەریکی ڕاوەشکار بوو!!

بیرکردنەوەی میر هەر لە پاوانەکەی خۆی بوو. ئەو بیرکردنەوە لەزات و بەرژەوەندیەکانی خۆی لەخۆیدا بیرنەکردنەوەیە لە غەیری خۆی. ئەوەی پێی دەوترێ (ئەویتر) نەك هەر میر بیری لێ ناکاتەوە، بەڵکو بە کردەوە هەموو هەولێك دەدا بۆ ئەوەی نەیهێڵێ!! دەوڵەتی میر عەقڵی میر بوو، هەتا ئەو شوێنەی سنوور بوو میر لەوێ بوو. ئاخاوتنی میر دەستور بوو، هەموو دەبوو بڵێن فەرمایشتە ئەی خاوەن شکۆ! میری بادینان دەڕوخێنم، هەموو: فەرمایشتە گەورەم. هەموو یەزیدیەکان قڕدەکەم، هەموو: فەرز و واجبە گەورەم. هەموو میرەکانی تر خایەنن. ڕاست دەفەرمووی گەورەم!! کێ ڕۆژێ لە میری خۆی ڕاپەڕی؟! ئەمە دەستورە. مەلاش لەولاوە دەیوت: ئیتاعەی وەلیولئەمر واجیبە. ئەمە ئەو کەلتورەیە چەندەها ساڵە

بۆتە مێردەزمەی عەقڵی کوردی و نایەڵێ کەس بە ئاسانی لێی دەرباز بێ، دەبێ ئەمە تەلیسم نەبێ؟!

ئێستاش دەڵێن دەوڵەتمان نییە. چواردەورەمان دوژمنە! مەسەلە ئەوە نییە دەوڵەت گرفتە یان گرفت نییە. گرنگ گۆڕان لە هزر و بیرکردنەوەی تاکی کوردە. دەسەڵات ناتوانێ کۆمەڵگایەکی مەدەنی پێکبێنێ هەموو نەیارەکان لەسەر یەك خوان کۆببنەوە، چونکە ئەوەی پێ هەرس ناکرێ. ئەی کەلتوری دەستور مانای چی؟! من خۆم دەوڵەت هەبوون و نەبوون بە گرفت نابینم، چونکە بۆ ئێمە پازدە ساڵە چیمان هەیە. ئەرێ عەرەب کێشەی هەبوونی دەوڵەتی هەیە؟ کێ بە ئەندازەی عەرەب دەوڵەتی هەیە؟!

بۆچی لەهیچ دەوڵەتێکی عەرەبیدا ڕەوشێکی دیموکراتی هەقیقی بەرپا نییە. لەسەر لالێکردنەوەی ڕژێمەکان لە هەندێ بواردا قسەی باوکی برایەکی نزیکم دێتە یاد ئەیوت: ڕژێم خۆی ئەو شتانە دەکا تا بەو شتانە بتانگرێ!! سەرۆکی (حیزبی غەد) لەسەرچی گیراوە.. دەبێ ئەویش تیرۆریست بێ پێمان نەزانیبێ؟!

ئێمەی کورد هێندەی پێویستمان بە دەوڵەتێکە لەناو عەقڵمان هێندە پێویستمان بە دەوڵەتی سەر زەمین نییە. ئەوە دەوڵەت دروست بوو کێ دەوڵەت بەڕێوە ببا، وەك وتم بۆ لە نیشتمانی عەرەبیدا چەند دەوڵەت هەن؟ عەقڵی دەوڵەتی، عەقڵی مەدەنی، عەقڵی یەکتر قەبوڵکردن.. عەقڵی ئەویتر زۆرگرنگە ببێتە بەشێك

لە ستراتیژیەتی بیرکردنەوەمان، ئێمە بەدەگمەن ئەو عەقڵانەمان لەلا هەن، ئەوەی جاریَ هەشە سەر بە هەشە و دەسەلاّتی مەعریفی بەقەد دەسەلاّتی چەکدارێکی کالّفامەوە نییە.

ئەمە ڕوویێکی مەسەلەکەیە، ڕووەکەی تر عەقڵێکی خوێندەوار بەڕوونی دەیبزوێنیَ. ئەگەر دوێنیَ کرمانج نەیدەتوانی لە غەیری ئەشهەدوبیلا بۆ ئاغا بلّیَ کە ناچار بوو هەر هێندەی دەزانی ئەمڕۆ بابای خوێندەوار بە قەلّەمەکەی هەزار ئەشهەدوبیلا لەسەر دەستوری ئاغاکەی ئەمڕۆ دەلّیَ. بەمەش دەستورەکە (پیرۆزتر) دەبیَ و هەر لادانێکیش لەو پیرۆزییە ئەوا وەك هندییە کۆنەکان دەیانوت: (پیرۆزی دەقەکە دەشێوێنیَ!). ئەم قەلّەمە دایك و باوکی نییە. زورنایەکە بەقەد شاباشەکەیە!

هەندیَ جار ڕەوشەکە وادەخوازیَ لە بیکیت و ئەلبێرکامۆ رەشبین تر بن. تۆ خەمی پرسی هەبوون و نەبوونی دەولّەتتە، کەچی سەرکردایەتی سیاسی کوردی هەر بیر لە مەسەلەی دەولّەت ناکاتەوە. لەبیرکردنەوەی خۆتدا دەگەیە ئەو ئاکامەی کە شیعە و سوننەی عیّراق بەهیچ جۆریَ بەو فیدرالّیەتە ڕازی نابن کە کورد دەیەویَ. هەروەها ئەگەر زیاتر بەگژ فکران ڕابچی بۆت دەردەکەویَ کە ئەو (سیَسەرکە) لەو مەنجەلّە (عیّراق) قەت پێکەوە ناکولّێن، هێشتا سەرکردایەتی کوردی ئیش بۆ بەهێزکردنی (برایەتی) و یەکێتی خاکی عیّراق دەکات. ڕۆژ نییە من خۆم تووشی هێدمە و

شۆك نەبم، چونکە هیچ ئایندەیەکی ڕوون بۆ خـۆم و غـەیری خـۆم نابینم، کەچی دەبێ کوڕی گەدا بەکچی پاشا ڕازی بێ!

بەنەزەر من هەبوون و نەبوونی دەوڵـەت هـیچ لـە مەسـەلەکە ناگۆڕێ، ئەدی ئەوەنییە مارکسییەکان خەون بەوە دەبینن کە ڕۆژێك دادێ ئەو دەوڵەتەی پرۆلیتاریا دایمەزراندووە هەر خۆی دەیڕوخێنێ، چونکە پێویست نییە! دەوڵەتەکەی ئێمەش هێشتا خەونی شێت و شاعیرانە، هێشتا نەبۆتە بیرۆکە دەیڕوخێنین، چونکە نازانین چی لێ بکەین، نە ئەو تێمان دەگا و نە ئێمەش لـەکاری وی دەگـەین! بـە منداڵی دایك و باوکمان ئێمەیان بـە (دێـو) و (خێـو) و (شـەوە) دەخەوتانـد، هەنـد نووسـتین هێـشتا لـەبواری تـەنویمی موگناتیسییەکە ڕزگارمان نەبووە، بۆیە ئێـستاش بـە (کارەبـا) و (نەوت) و (بەنزین) دەمانوێنن.

دەبێ کاری باوکانێك هەر نوستاندنی ئێمە نەبێ تا ڕۆژێـك وەك ئەسحابی کـەهف لـە خـەو رادەپـەڕین دەبیـنین هـەموو شـتەکان پێچەوانە بوونەتەوە!

لەدووسێ جێ (لە کتێبەکانم) وتوومـە فاکتـەرەکانی دروسـت نەبوونی دەوڵەتی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری زاتی و بابەتییەکان، بەڵام ئەمڕۆ هێندەی باوەڕم بە فاکتەری زاتـی هەیـە هێنـدە بـاوەڕم بـە فاکتەری دی نییە. ئێمە نەمانتوانیوە خۆمان دروست بکەین، بۆیە بەدرێژایی مێژوو میللەتێکی پاشـکۆین. لـە نـەزەری دکتـۆرێکی

# سێ زاتی کورد
# له دادگای ناسیۆنالیستی کوردیدا

لێرەو لەوێ چەندان نووسین لەسەر هۆکاری بەدەوڵەتنەبوون نووسراون. زۆرکەس بە بێ بەڵگەی کۆنکریتی هۆکاری بنەڕەتی دەگەڕێنێتەوە بۆ هەندێ زاتی کورد. لێرەدا بەگرنگی دەزانین لەسەر سێ زاتی کورد بەجواب بێین، ئەویش مەولانا ئیدریسی بەدلیسی و مەلای خەتێ و شێخ مەحمود.

لە سەردەمی مەولانای بەدلیسیدا ململانێیەکی مەزهەبی لە دەڤەرەکەدا لەئارادابوو. بەحوکمی ئەوەی کوردستان لەنێو بەرداشی هەردوو ئەمپراتۆریەتی ئۆسمانی و سەفەوی دابوو، بەشێکی زۆری نەهامەتییەکانی وەبەر دەکەوت. ئەوسا میرە کوردەکانیش هیچ دەسەڵاتێکی عەسکەری و سیاسی ئەوتۆیان نەبوو بتوانن پەرگیر بن و نەبنە هاوپەیمانی هیچ لایەك!

ڕێژەی هەرە زۆری کورد سونە مەزهەبە. لەنێو ئەو سونانەی باکوری کوردستان مەولانا ئیدریسی بەدلیسی سیاسەتمەداری زەمەنی خۆی بوو. ئەو زاتە بەو عەقڵە مەعریفییەی خۆی توانی لەگەڵ سوڵتان سەلیمی (ئەمپراتۆری) ئۆسمانی ڕێک بکەوێ. ڕێککەوتنەکەی بەدلیسی-سوڵتان هاوپەیمانییەکی دوولایەنی بووە.

بەدلیسی توانیبووی ببێتە نوێنەری میر و ئاغەکانی کورد. بەڕای ئەوان ئامادەبوو "سوپای کورد" ببێتە بەشێك لە لەشکری ئۆسمانی شەڕی سەفەویەکان بکات، لە بەرامبەریش، سوڵتان سەلیم بەڵێنی "فیدراڵی" بۆ کوردستان دابوو. ڕەنگە لە فیدراڵیش زیاتر بووبێت، چونکە ئەو بەڵێنەشی تیابوو، هەر دەستدرێژییەك بکرێتە سەر کورد و ئەو ئیمارەتانە، ئەوا دەوڵەتی ئوسمانی بەهاواریەوە بێت. بەو شێوەیە ڕێکەوتنەکە لە خاڵی (٤)یدا بەرەو دوو دەوڵەت دەچێت، ئەگەرچی هەریەك لە بەدلیسی و سوڵتان سەلیم بە ماوەیەکی کەم دوای شەڕی چاڵدێران ١٥١٤ مردن، بەڵام ئەو ڕێککەوتنە کە نیزامی لامەرکەزی لێکەوتەوە، نزیکەی چوارسەدە کوردستانی لە نەهامەتی و ماڵوێرانی پاراست!!

ئەو ڕێککەوتننامەیە، کە فیدرالیەتی کوردستانی لێکەوتەوە، چونکە لەلایەن زاتێکی دینییەوە بۆ کوردستان هاتۆتەدی، نووسەرە "نائەکادیمیەکان!!" لەو زاتەیان لە هەڵلا داوە بەجۆرێ هەیە ئەمەی بە خیانەت داناوە. کێشەی ئەو نووسەرانە ئەوەیە دوێنێ بەچاوی ئەمڕۆ دەخوێننەوە، هەروەها مێژوو دەشێوێنن و دەیانەوێ وا بە نەوەی نوێ رابگەیەنن کە ئەوسا کوردستان ئازاد بووەو هەموو کوردستان لەژێر ئاڵای یەك میردا بووە و کوردستان شامی شەریف بووە! ئیدریسی بەدلیسی ئەو دوو سێ بەشەی

کوردستانی خستۆته ژێر دەسەڵاتی ئۆسمانییەوە!

وەك چۆن لەم زەمەنەدا سەرانی کورد یەك نین، ئەوسا زۆر خراپتر، بەحوکمی ئەوەی میرەکان هەموو دەرەبەگ و ئاغا بوونە، هەمووش دژیەك بوونە. خانی لە (مەم و زین)دا لەم بارەیەوە راستییەکی مێژوو تۆمار دەکات، کە میرانی کورد هەموو ناکۆك و هەڤدژی یەکتر بوونە. ئیدریسی لەو زەمەنەدا توانی لەلایەك فیدراڵی بۆ کوردستان فەراهەم بێنێ، بەجۆرێ هەتا سەدەی نۆزدە هیچ کێشەیەکی ئەوتۆ لەنێوان میرانی کورد و دەوڵەتی ئۆسمانی لەئارادا نەبووە. ئەگەر لێرەو لەوێ کێشەیەك هەبووبێ، ئەوا لەنێوان میرانی کوردیش خۆبەخۆ هەبووە.

ئێمە لەنووسینێکمان بەکورتی باسمان لەوە کردووە کە بۆچی لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئەو هەموو کێشەیە کوردستانی گرتەوە! لەوێ بەئاشکرا و بە بەڵگەوە روونمان کردۆتەوە کە مسیۆنێرەکان و بیانییەکان و کەمایەتییە ئایینیەکان و گۆرانی نیزامی دەوڵەتی عوسمانی لەلامەرکەزییەوە بۆ مەرکەزیەت ئەو هەموو ماڵوێرانییەی لێکەوتەوە. بە واتای ئەوەی مەولانا ئیدریسی بەدلیسی بۆ کوردستانی هێناوەو ئێستاشی لەگەڵ دابێ هیچ میرێکی کورد ئەوەی بۆ کورد نەکردووە.

سەدەی نۆزدەهەم، سەدەی رووخانی میرنشینە کوردیەکان بووە. ئەو هەموو میرنشینە بەرلەوەی ببنە پارۆیکی چەور بۆ سەرانی

دەوڵـــەتی ئۆسمـــانی خۆیـــان مۆرانـــەی خۆیـــان بوونـــە. ئەوەتـــە میرنشینێکی وەك میرنشینی سۆران کێـشەو ململانێـی چـەکداری لەگەڵ میرنشینی بادینان و بابان و ئەردەلان هەبووە. میر محمد، کە دوا مـیری ئـەو میرنـشینە بـووە، لـەلای هەنـدێ لـە نووسـەرانی ناسیۆنالیست کراوەتە باوکی رۆحی ناسـیۆنالیزمی کـوردی، ئـەو هەموو شەڕەی لەگـەڵ میرەکـانی دی بـە بەهانـەی دامەزرانـدنی "دەوڵەتی قەومیی" لێکدراوەتەوە!

ئەوەی لێرەی گرنگـە روخـانی ئـەو میرنـشینەیە. قەومییـەکان "فەتوا"ی مەلای خەتێ بەهۆکاری سەرەکی روخانی ئەو میرنشینە دادەنێن. هەتا شاعیرێکی وەك شێرکۆ بێکـەس مـەلای خـەتێ بـە "مەدرەسەی خیانەت" دادەنێ! ئەوەی ئەو برادەرانە دەیڵێن هیـچی لەسەر بنەمایەکی لۆژیکی یاخود دۆکیۆمێنتێکی کۆنکریتی بینا نەکراوە، بەڵکو تەنها زەنێکی رووتە. ئەو زەنە ڕووتەش رەنگدانەوەی نالۆژیکی و نائەکادیمی ئەو نووسەرانەیە.

لەڕوویەکی تر، هەندێ کەس هەر لەسەر بنەمایـەکی زەنییـەوە هاتووە داکۆکی لە مەلای خەتێ کردووە. هەر ئەو "زەنانە" هانیان داین لەسەر بنەمایـەکی مێـژوویی و لۆژیکییـەوە ئـەو "لیلییـە سەپاوە"ی سەر ئەو زاتەش ڕۆشن بکەینەوە. دەریبخەین کە مـەلای خەتێ نە بە ئیجابی و نە بە سلبی هیچ فەتوایەکی نەداوەو میریش ئەو زاتە نەبووە گوێ لە شـیعەت و ئامۆژگارییـەکانی زاتێکـی وەك

مەلای خەتێ بگرێ.

هەموو دەزانین میر محمد پیاوێکی زۆر توند بووە، بەجۆری نزیکترین کەسانی خۆی تیرۆر کردووە، هەروەها شەڕی سەختی لەگەڵ میری بادینان و ئێزیدییەکان کردووە. ئەو میرە توندە چۆن رازی دەبێ کەسێکی وەك مەلای خەتێ فەتوایەك بۆ سوپای میر بدات و پێیان بڵێ: ئەوەی شەڕی ئۆسمانییەکان بکات لەدین وەردەگەڕێ و تەڵاقی دەکەوێ. ئەو مەلایە لە ڕەوازندزیش دابنیشێ! ئەمە چ لۆژیکێکە ئەو ئەفسانەی قەبوڵ بێ؟! نەك مەلای خەتێ بەلکو هیچ کەسێ لەدەست و پێوەندەکانی جورئەتی ئەوەیان نەکردووە شتی ئەوها بەمیر بڵێن. ماکدۆل لە The modern History of the kurds رێك لە شوێنی مەلای خەتێ ناوی "ریچارد ود" دێنێ. ماکدۆل دەنووسێ ئەو جاسوسەی بەریتانیا توانی میر محمد رازی بکات شەڕی ئۆسمانییەکان نەکات، بەمەش سەری پارێزراو دەبێ. نووسەرە قەومییەکانمان بەبێ بەلگە "مەلای خەتێ" تاوانبار دەکەن، کەچی لەراستیدا ماکدۆلێکی مێژوونووس بە بەلگەوە باس لەوە دەکات کە ریچارد ود میری رازی کردووە دەستبەرداری شەڕ بێت. چونکە بەریتانیا تاراتەیەك داکۆکی لە ئۆسمانی دەکرد، تا پارچەپارچە نەبێت و لەدەستی دەرنەچێت، لەو رووەوە رێی لە (محمد عەلی پاشا)ش گرت کە لەشام بکشێتەوە میسر، هەمان کرداریشی لەدژی روسیا کرد، بۆیە بەریتانیا

مەلای خەتێ بگرێ.

هەموو دەزانین میر محمد پیاوێکی زۆر توند بووە، بەجۆرێ نزیکترین کەسانی خۆی تیرۆر کردووە، هەروەها شەڕی سەختی لەگەڵ میری بادینان و ئێزیدییەکان کردووە. ئەو میرە توندە چۆن رازی دەبێ کەسێکی وەك مەلای خەتێ فەتوایەك بۆ سوپای میر بدات و پێیان بڵێ: ئەوەی شەڕی ئۆسمانییەکان بکات لەدین وەردەگەڕێ و تەڵاقی دەکەوێ. ئەو مەلایە لە ڕەوازندزیش دابنیشێ! ئەمە چ لۆژیکێکە ئەو ئەفسانەی قەبوڵ بێ؟! نەك مەلای خەتێ بەڵکو هیچ کەسێ لەدەست و پێوەندەکانی جورئەتی ئەوەیان نەکردووە شتی ئەوها بەمیر بڵێن. ماکدۆل لە The modern History of the kurds ڕێك لە شوێنی مەلای خەتێ ناوی "ریچارد ود" دێنێ. ماکدۆل دەنووسێ ئەو جاسوسەی بەریتانیا توانی میر محمد رازی بکات شەڕی ئۆسمانییەکان نەکات، بەمەش سەری پارێزراو دەبێ. نووسەرە قەومییەکانمان بەبێ بەڵگە "مەلای خەتێ" تاوانبار دەکەن، کەچی لەراستیدا ماکدۆلێکی مێژوونووس بە بەڵگەوە باس لەوە دەکات کە ریچارد ود میری رازی کردووە دەستبەرداری شەڕ بێت. چونکە بەریتانیا تاراتەیەك داکۆکی لە ئۆسمانی دەکرد، تا پارچەپارچە نەبێت و لەدەستی دەرنەچێت، لەو ڕووەوە ڕێی لە (محمد عەلی پاشا)ش گرت کە لەشام بکشێتەوە میسر، هەمان کرداریشی لەدژی روسیا کرد، بۆیە بەریتانیا

ویستویەتی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ بەرپێنە بداتە بەر ئەو دووهێزە.

لەلایەکی تر هەندێکی تر هەر بەبێ بەڵگە باس لەوە دەکەن کە لەوانەیە مەلا خەتێ بۆ بەرژەوەندی میرنشینەکەو خەڵکەکەوە فەتوای لەو جۆرەی دابێ. وەك وتمان لە بنەڕەتدا هیچ فەتوایەك بوونی نییە. "مەلای خەتێ"ش زاتێکی دیاری سەردەمی خۆی بووە، بەڵام نەیتوانیوە کار لە میر بکات کە بڕیك لێبوردە بێ و بە ئاشتی چارەسەری ململانێیەکانی لەگەڵ نەیارەکانی بکات. ئێمە دەزانین کە میر شەڕی بادینان و بابانی کردووە. جا چۆن مەلای خەتێ هیچ فەتوایەکی لەسەر "شەڕی کورد -کورد"ەوە نەداوە و لەسەر شەڕی "کورد-ئوسمانی"یەوە داوە؟! ئەمەو ئەگەر فەتوایەکی وا لە ئارادا بووایە چۆن مەلای خەتێ جورئەتی ئەوەی دەکرد لە کوردستان بمێنێ و لە تیرۆری دەست و پێوەندەکانی میر ڕزگاری بێ..

بەکورتی ئەو فەتوایە کە ناونراوە بە فەتوای مەلای خەتێ تەنها لە واهیمەو عەقڵی و نەخۆشی هەندێ نووسەرەوە بوونی هەیە، ئەگەرنا ئەوە "ریچارد ود"ە تەلقینی میری داوە کە شەڕی دەوڵەت نەکات.

لە سەدەی بیستەمیش، تەوقەنەکردنی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیز بۆتە بنێشتێکی تری هەندێ نووسەر و هەر دەیجوونەوە. ئەگەر شێخ تەوقەی بکردبا ئێستا کورد دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی

دەبوو! برادەرێکی دکتۆرم هەیە زۆرجار کە هەندێ شتی نامـاقوولّ دەبینێ دەلّێ: بژی تەخەلوف!! بەڕاستی ئەمە تەخەلوفە!

ئـەوەی یاداشـتەکانی رەفیـق حیلمـی و "چـیم دی"ی ئەحمـەد خواجەی خوێندبێتەوە، بۆی دەردەکەوێ کە ئەو تۆمەتـە چـەند لـە راسـتییەوە دوورە. ئـەو بـرادەرە ئینگلیـز دۆسـتانە لـە ئینگلیـز ئینگلیزترن، ئەگەرنا دەبێ چاك بـزانن کـە بـەر لـەوەی ئینگلیـز هـەموو عێـراق بـەو کوردستانیـشەوە بگـرێ لـە سـالّی ١٩١٦ بەگوێرەی رێککەوتننامەی سایکس-پیکۆ باشوری کوردستانی بـۆ فەرەنـسا داترابـوو، بـەلاّم پاشـان لەسـان ریمـۆ (لۆئیـد) تـوانی (کلیمانسۆ) رازی بکات دەستبەرداری باشوری کوردسـتان بـێ بـۆ ئینگلیز!!

لەلایەکی تر شێخ نەك هەر ئامادەی تەوقـەکردن بـووە، بـەلّکو بەرلەوەی ئینگلیز تەواو "کـەرکوك"یـش کـۆنترۆل بکـات، شێخ نامەی بۆ سەرانی ئینگلیز ناردووەو هەتا سەربازە تورکەکانیشی لە سلێمانی دەستبەسەر کردووە لە بەرامبەریش ئیتیحادیەکان سـزای مەرگیان بۆ دانابوو!!

وێڕای ئەوەش هـەموو دەزانـین "لیـنین" سـەرۆکی دەولّـەتێکی "سۆشیالیستی" بووە کە تەواو دژ بە ئایینی شێخ مـەحمود بـووە، کەچی شێخ سێ نامەی بـۆ "لیـنین"یـش نـاردووە، کـە بـەهانای کوردەوە بێت، کە ئاکام "لینین" نەك هەر بە هانای نامەکانی شێخ

نەهاتووە، کەچی بەڕەسمی دانی بە دەوڵەتی تورکیای کەمالی نـاوەر پاڵپشتی ماددی و عەسکەریشی کردوون!

ئنجا وەزیری دارایی (شێخ مەحمود) کەریمی عەلەکە بـوو، کـە مەسیحی بووە، ئیتر مانای تەوقە چی دەمێنێ؟

جا با شێواندنی مێژوومان بەس بێ، ئەو زاتانە سیاسـەتمەداری سەردەمی خۆیان بوون، زۆریان بۆ کورد کرد، ستەمە پاداشتیان بە "خیانەت!" بدرێتەوە. هەروەها دەبێ ئەوەش بزانین ئەوەی تۆمـەتی خیانەت دەداتە پاڵ یەکێك بەبێ بەڵگە، ئەوەی هەر خـۆی بەشـێك لەو خیانەتەی بەردەکەوێ. ❑

## ١ + ١ = ١

# خوێندنەوەیەك بۆ ناسیۆنالیزمی كوردی

هەتا ئاغا هەبوو، بەشی جوتیار تەنیا سەپانی بوو! لە كۆمەڵگای دەرەبەگیدا بەگ و ئاغا و كێخوا هەموو شتێ بوون. غەیری ئەوان هەر بە هی ئەوان حسێب بوون بەجۆرێ لە هەندێ دەڤەر بە غەیری خۆیان دەگوت (كرمانجەكانمان). بەواتای هەروەك چۆن زەوی و زار و مەڕ و ماڵات و ڕەشەوڵاغ موڵكی ئەوان بوون، كرمانجەكانیش بەشێك بوون لە موڵكی ئەوان!

ئەوان ئاغا بوون! لە زەمەنێك دەژیان كرمانجەكان نەیاندەزانی لەشاری چ باسە، بۆیە ئەوەی پێی دەوترێ (ئەویتر the other) لە فەرهەنگی هیچ ئاغایەكدا نەبوو.

ئەوەی ئێمە دەمانەوێ گەنگەشەی لەسەر بكەین، هەمان دیاردەیە لە زەمەنێكی تردا، بەقەولی خۆیان لە كۆمەڵگەیەكی تردا. لە زەمەنی ئاغادا، (ئاغا + كرمانج) هەر ئاغا دەردەچوو، چونكە ئەویتر وەك گوتمان تەنیا بەشێك بوو لە مومتەلەكاتی ئاغا!!

دەبێ لە زەمەنی "عەولەمە"دا، كە زۆربەی شتەكان لەنێو یەكدا دەتوێننەوە. ئەوەی پیرۆزیشە خەریكە بە "ناپیرۆز" دەكرێ،،

بۆ نموونەی "بەرەی پیرۆز" و "بەرەی ناپیرۆز" نەمێنێ!! تا لەم گێژەنەدا دەسەڵاتی کوردی غەیری خۆی چۆن دەخوێنێتەوە؟!

هیچ کەسێ نکوڵی لەوە ناکات کە دەسەڵاتی کوردی بانگەشەی "عەلمانیەت" دەکات و هەوڵ دەدات -بەقەولی خۆی- وڵات بەرەو ڕۆژئاوا بەرێت. نموونەی ئێستا وا لە عەلمانیەت گەیشتووە کە دەستور چۆن بۆ مەلیکە ئاواش بۆ فەرمانبەرێکە. لەڕێگای پرۆسەی هەڵبژاردنەوە کورسی دەسەڵات بەرپەری گیانی وەرزشییەوە بۆ "ئەویتر" چۆڵ دەکرێ.

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەسەپێنێت، دەبێ ڕۆژئاوا هەر بە فیترە ئاوا گیانی لێبووردنیان لەگەڵ یەکتر هەبووبێ؟! دەبێ "مەسیحیەت" فاکتەری خولقێنەری ئەو دیاردە حەزاری و مرۆڤدۆستییە بێت؟

بە کورتی ئەو ڕۆژئاوایەی ئەمڕۆ لافی مرۆڤدۆستی لێدەدات، گەورەترین دڕندەی سەرزەوی بوونە، هەتا پێیان کراوە لە یەکتریان کوشتووە، هیچ گەلێکی ئەورووپی مێژوویێکی کۆنی پۆزەتیڤی نییە. ئەو مەسیحیەتەی ئێستاش نەك هەر فاکتەری پۆزەتیڤ نەبووە، بەڵکو فاکتەرێکی بەکۆیلەکردنی عەقڵی مرۆڤی ڕۆژئاوا بووە. ئێستاشی لەگەڵدابێ پرۆستانیەك کاسۆلیکێکی قەبووڵ نییە!

ئەوان لە کوشتن و فەرهود و پاتاڵ بێزار بوون، تێر بوون ئـەوجا لەنێو خۆیـان- دەسـتبەرداری بـوون! ئـەو ئەمریکایـەی ئـەمڕۆ زلهێزترین هێـزە لەسـەر زەویـدا، هـەتا بڵێـی مێـژوویکی ڕەشـی نائینسانی هەیە. لەنێو خۆیان دیموکراسین، لـە دەرەوە هـەژموونی فیرعەونیانەی خۆیان بەسەر غەیری خۆیان دەسەپێنن.

ئا لێرەوە هەندێ جاران کە بەگژ فکران ڕادەچـم وەهمـێکم لـەلا دروست دەبێ، کە بۆچی دەسەڵاتی کوردی جـارێ ناتوانـێ غـەیری خۆی قەبووڵ بکات؟! بۆچی دەسـتبەرداری شـەڕی رکابـەری خـۆی نابـێ. بێگومـان دروسـتکردنی کۆمەڵگایـەکی مـەدەنی لـە "چـاولێکردنەوەیەکی نـەزەری"دا بەرقـەرار نابـێ، بـەڵکو وەك مارکسیەکان دەڵـێن حەتمیـەتی مێـژوویی وادەخـوازێ کۆمـەڵ و عەقڵی مرۆڤ قۆناغەکان ببڕێ!! دەبـێ دوو قـەرن بـەس نـەبێ لـە کوشتنی یەکتر و قبوڵ نەکردنی یەکتردا مارکسیەکان زەنیان وابوو کە نابێ دوو حیزبی شیوعی لە وڵاتێکدا هەبێ، ئەگەر هەبوو دەبێ یەکێکی "زۆڵ" بێ، هەروەها مەیەکانی کوردیش لە رابردوودا هـەر بەو "ڕێسا!"یە بەڕێوە دەچوون. هەرچـەندە خـۆی بـە "ڕەسـەن" و ئەویتری بە "ناڕەسەن" دەدیت.

لەسەر بەزمی کوردایەتیش هـەتا شـەکەت بـوون، حیزبـەکان کوردیان بەکوشتدا. لەمەشدا لەوانەیە ئەو حیزبانە هـەر پـەیڕەوی یەکێ لـە رابـەرانی مارکسـیەتیان کردبـێ کـە دەیـوت لـەپێناو

سەرکەوتنی مارکسیەتدا لام ئاساییە ئەگەر یەك لەسەر چواری بەشەریەت لەناو بچێ!!

ئەوانی ئێمەش وەك رۆژئاوا خەریکە لە یەکتر کوشتن بێزار دەبن.. ئەگەر بێزاریش نەبن بەرژەوەندی هاوبەش واخەریکە لەبەرەیەکدا کۆیان دەکاتەوە. کۆبوونەوەی دژەکان لەبەرەیەکدا ئەمرۆ بۆتە حاڵەتێکی تەندروست و سروشتی.

لە فلمێکی ئەمریکیدا، کارەکتەرێکی فلمەکە دەڵێ: ئەمە دنیایە باپیرانمان شانازیان بەوە دەکرد کە ڕاوە هیندیان دەکرد، ئەمڕۆش لەشەڕی دووەمی جیهانی هیندیەکان لەسوپای ئێمەدان شەڕی یابانیەکان دەکەن.. کێ دەڵێ بەیابانیش نەوەکانمان لەگەڵ یابانیەکان لە سوپایەکدا نابن شەڕی دوژمنێکی هاوبەش ناکەن؟!

خۆ ئەمڕۆ ئەمە ڕوویداوە!!

ئەو هەموو ململانێیە ژێدەرەکەی قەولێکی شەیتانیە "انا خیر منه" یان فیرعەون گوتەنی "انا ربکم الاعلی"یە.. دەبێ بتوانن دەستبەرداری ئەو خێو و خووە بن؟! با وەلاّم تەنیا لای ئەو کەسانە بێ کە لە ماهیەتی مشکلەکان دەگەن!

خاڵێکی تری گرنگی ئەم بابەتە ئەوەیە: دەبێ کۆمەڵگەی مەدەنی چی بێ؟ دەبێ مەدەنیەت پەیوەست بەچی بێ؟

لە ڕۆژئاوا تاڕادەیەك مرۆڤ هەست بەوە دەکات کە هەندێ مافی هەیە، جا ئەو مافانە چ مافی مەدەنی بن یان سیاسی. ئەوان

بەجۆرێك لە مەدەنیـەت دەگـەن كـە زۆر جیایـە لـە مەدەنیـەتی مەملەكەتی ئێمە. ئەوەی گرنگە عەقڵ مەدەنی بێت نەك جەستە و پۆشاكی مرۆڤ. كە عەقڵ مەدەنی بوو زۆربەی شتەكان پارسـەنگی خۆیان وەردەگرن. كـەم هەڵدەكـەوێ شـتەكان لـە سـنوری خۆیـان دەربچن. زۆر گرنگە عـەقڵ ئاراسـتەی دەسـەڵات بكـات، چـونكە لەكۆندا دەسەڵاتداران هەردەم لەبـەر قـاپی عەقڵـداران دا بـوون، ئێستاش لە هەندێ وڵاتی ئەورووپادا ئەو دیاردەیـە هەیـە، هەركـە دەسەڵاتدار لە سـنوری دەسـەڵاتی خـۆی دەرچـوو، بـەزەبری یاسـا دەیهێننـەوە سـەر خـەت! ئەوەتـە لـە بـەریتانیا تـەواو یاسـاكەی عومەری كوڕی خەتاب، كە دەیوت "مـن ایـن لـك هـذا" پـەیڕەو دەكەن. بلێر ناتوانێ بـە ئیـشی ڕەسمـی وڵات هەڤژینەكـەی خـۆی لەگەڵ خۆی لەسەر حسابی بودجەی وڵات بیات!

لەلای ئێمە ئەوەی بەناو لەسەر دینی عومەری كـوڕی خەتابـە، نەك هەڤژینەكەی، بەڵكو ئابا و ئەژدادیشی بە "مـوڵكی كـورد" تێركردووە!

وەك وتمان لە ئەورووپا كۆمەڵگەی مەدەنی هەیە "بەشێكی" ئەو كۆمەڵگەیە عەقڵێكی مەعریفی و مەدەنی دروست كردووە، بـەڵام چونكە "عەقڵێكی سیاسی" ئاراستەی دەكات، خەریكە لەناو ئەو كۆمەڵگەیەی مرۆڤدا، مرۆڤ ون دەبـێ. لـەوێ ڕاسـتگۆیی، یـەكتر قـەبوڵكردن، ئینتمـا بـۆ دامودەزگـای كـار و وڵات و خەیانـەت

نەکردن، لەسیما دیارەکانی کاری هەر تاکێکی ڕەوشەنبیری ئەورووپییە. دەبوو ئەوانە هەموو لە کۆمەڵگەی ئێمەبوونی هەبوایە، چونکە دینی ئێمە زۆر جەخت لەسەر ئەو بنەما و شەنگستانە دەکات.

بوونی پەرلەمان و حکومەت و زانکۆ و کۆڕی زانیاری و دام و دەزگای مەعریفی و مەدەنی تر لە وڵاتدا ئەوە ناگەیەنێ کە ئێمە کۆمەڵگەیەکی مەدەنیمان هەس، چونکە هەموو ئەمانە ئەگەر تەواو دەسکردی حیزبیش نەبن، حیزب بەڕێوەیان دەبات. زۆر دەگمەنیش هەڵدەکەوێ عەقڵێکی مەعریفی، ئینسانی مرۆڤدۆستانە دەسەڵاتێکی ئەوتۆی لەو دامودەزگایانە هەبێت!

مەدەنیەت و مرۆڤدۆستی لە عەقڵدایە نەك لە جەستەو جلوبەرگ. هەروەها زۆرانێك هەن باوەڕیان وایە کە چەند کۆمەڵگە ئافرەتی ڕووت یان نیوەڕووت بێ، ئەوەندە مەدەنییە! ئەگەر مەدەنیەت ئەمە بوایە ئەوە بێگومان کۆمەڵگەی پێش مێژوو لە هەموو کۆمەڵگەیەکی تر مەدەنیەتی تر بوون.

لە هەموو وڵاتانی عەرەبیدا بەدەگمەن سەرکردەیەك دەدۆزیەوە کار بۆ "یەکێتی عەرەبی" بکات، کەچی هیچ کامیان نیە چەندەها وتەی ئاگرینی بۆ کۆمەڵە ساویلکەکەی نەبێ لەوبارەیەوە. ئەوە سەدەیەك تەواوبوو کەچی دەسەڵاتدارانی عەرەب نەك نەیانتوانی ئەو یەکێتیە لەسەر زەوی دروست بکەن، بەڵکو ئەوەی

۱ + ۱ = ۱

# خوێندنەوەیەك بۆ وتارێكی فەهمی هوەیدی

من خۆم چاوەڕێم نەدەکرد نووسەرێکی وەك فەهمی هوەیدی وەك عەرەبێکی ناسیونالیست بیر بکاتەوە. هوەیدی یەکێ لەو نووسەرانەیە لە زۆر نووسینێدا داکۆکی لە کورد و مەسەلەی کورد کردووە، بەڵام داگیرکردنی عێراق و ڕووخانی رژێمی عەرەبی عێراقی ئەویشی تەنگەتاو کردووە وەك عەرەبێکی ناسیۆنالیست بیربکاتەوەك نەك وەك بیرمەندێکی ئیسلامی.

هەرسێ مەسەلەی : ۱- گێڕانەوەی کورکووك بۆ کوردستان، ۲-مانەوەی میلیشیای پێشمەرگە وەك سوپایەکی تایبەتی کورد، ۳-شێوازی فیدراڵیزم بۆ سێ پارێزگا کوردییەکە تەوەرەی سەرەکی وتارێکی هوەیدین بەناونیشانی "کوردەکانی عێراق یاری بە ئاگر دەکەن".

من بەو ڕایەی هوەیدی مەندەهۆش بووم، چونکە ئەو چاك دەزانێ تا کوێ کوردستانە؟ ئەو چاك دەزانێ هەرسێ نەتەوەی هاوسێی کورد بەناوی دین چەند بەرامبەر کورد "بێ‌دین" بوونە! دەبێ "کورد" بۆچی ئەمەریکای پێ قەبووڵ بێ؟! یەقینم ئەگەر کورد لە برایەکانی ئەمین بوایە جارێکی تر هاوپەیمانێتی لەگەڵ

ئەمریکا بەتایبەتی رۆژئاوا بەگشتی نەدەکرد، چونکە رۆژئاوا فاکتەرێکی سەرەکی نەبوونی دەوڵەتێکی کوردی بووە لە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا!

هوەیدی گەڕانەوەی خەڵکی رەسەنی کەرکوکی بۆ دەڤەری کەرکوک "بە پرۆسەی دەست بەسەراگرتنی کەرکوک" تێدەگا دەرکردنی عەرەبی هاوردە بە "راگوێزانی هاوولاتیانی عەرەب و دەست بەسەر ماڵ و موڵکیان" تێدەگا.

جا ئەگەر ئەمە رای دۆستێکی دوێنێی کورد بێ، دەبێ دوژمن چ رایەکی هەبێت؟

کورد لە تەواوی سەدەی بیستەمدا شەڕی کەرکوکی بووە لەپێناوی کەرکووکدا بە هەزاران رۆڵەی بە قوربانی ئەو شارە کوردییە کردووە. جا لەپاش رووخانی فاکتەری مانەوەی کەرکووک بە عەرەبی دەبوو ئەو عەرەبانەی بەتانی کورد گەیشتنەوە دەسەڵات، بەبێ کێشە و ئاژاوە، ئەو شارە بەکورد بدەنەوەو ئیسپات بکەن ئەوانیش "سەدامی" نین! عەقڵ مەدەنی ین و باوەڕیان بە "غەیری خۆیان" هەیە! بەڵام مەحاڵە عەقڵییەت بگۆڕدرێ: عەرەبی ئەم سەردەمە باوەڕی بە غەیری خۆی نییە و هەر دەیەوێ خۆی هەموو شتێ بێ و غەیری خۆی نۆکەر و مەوالی بێ!

جا هوەیدی خۆت وەك من دەزانی کەرکووك نەك شارێکی کوردستانییە بەڵکو کوردییە، بەڵام رەوشی سیاسی دەڤەرەکە ئەم

حەقیقەتە تاڵەی ئێستای بەسەر ناوچەکەدا سەپاندووە. ئەگەر لای تۆ گەڕانەوەی کەرکوك بۆ کوردستان یاری کردن بە ئاگر بێت، بێگومان من دەرنەکردنی عەرەبی هاوردە لە ناوچەکەدا بە فاکتەری مانەوەی حاڵەتی زەوتکاری لەلایەك، باری ناسەقامگیری لەلایەکی تر تێدەگەم. لەو نێوەش نەوە لەدوای نەوەی کورد و عەرەب باجی ئەو ملهوڕیەی عەقڵییەتی عەرەبی دەدەن!

چ کوردێك لەگەڵ ئەوەیە ئاڵا سێ ئەستێرەکەی بەعس لەسەر کوردستان بشەکێتەوە؟ نازانم تۆ چۆن لەو ئاڵایە دەگەی؟ کەی ئەمە ئاڵای عێراقە؟ ئایا هێماکانی سەر ئەو ئاڵایە تەواو هەڤدژ نین لەگەڵ بیروباوەڕی بیرمەندێکی وەك تۆ؟! بۆچی هەرێمی کوردی تایبەتمەندی خۆی نەبێ؟ کەی دین رێ لەو مافە دەگرێ؟ لەژێر ئەو ئاڵایەدا بە هەزاران کورد و عەرەب بوونە قوربانی.. بە هەزاران مزگەوتی ماڵی خوا خاپوور کراون.. کەی رەوای هەقە ئەو ئاڵایە و هەڵگرانی ئەو ئاڵایە جارێکی تر لەو وڵاتە بژین؟

بۆچی پێشمەرگە نەمێنێ.. بۆچی سووپای نوێی عێراق لە کوردستان هەبێت؟ ئەوان لە کورد باشتر هەرێمەکە لە هەڕەشەکانی تورکیا و ئێران و سوریا دەپارێزن؟ ئەگەر بۆ داگیرکردن نەبێت دەبێ بۆچی پێویست بێ سوپای عێراق لە کوردستان هەبێت؟

ئەگەر سوپای لوبنان لە باشوری لوبنان بووایە، هیچ عەرەبێکی

چارەنووسی بۆ کورد فەراهەم دێنێ و دەوڵەتی سەربەخۆیی بۆ کورد دادەمەزرێنێ و ئەو کیانەی لە ئاکامی شەڕی یەکەمی جیهانی لە یەکهەڵوەشاوە بۆی دەگەڕێنێتەوە. بەڕای هوەیدی ئەو چارەسەرە ئاگر لە هەموو ناوچەکە بەردەدات و دەبێتە کارەسات بۆ کورد و لەوانەیە کورد زۆرترین زیانی بەربکەوێت.

بێگومان هەتا عەرەب بەو عەقڵیەتە بیر بکاتەوە، کە بەشێك لە کورد پاشکۆیەتی، ناوچەکە لە نەزیف بوونێکی بەردەوام دەبێت و رۆژئاوا بەگشتی و ئەمەریکا بەتایبەتی شوێن پێی لە ناوچەکەدا مکومتر دەکات. بەشێوازێکی تر، بەپێچەوانەی هوەدییەوە دەڵێم ئەگەر عەرەب غەیری خۆی پێ قەبووڵ بێ واز لە عەقڵییەتی فیرعەونیی بێنێ، نەیارە کلاسیکیەکانی خۆی، بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی دەڕووخێنێ. نازانم بۆچی عێراق بۆ سێ هەرێمی کوردی-سوننی- شیعی دابەش نەکرێ! تاکەی لاوی کورد و عەرەب ببنە خۆراکی عەقڵیەتێکی دواکەوتووی عەقڵیەتی عەرەبی، کە نە ئیسلامیە و نە غەربی!

چارەسەری دووەم بریتییە لە مانەوە لە چوارچێوەی عێراق دابینکردنی حوکمی زاتی و پاراستنی تایبەتمەندی و ڕەگەزی کوردی.. هەتا هوەیدی خۆیشی ئەو چارەسەرە بە چارەسەرێکی ناقس دادەنێ. لەو بارەوەش پەنا بۆ بنەمایەکی مەنتیقی ئوسولی دەبا کە دەڵێ: "بە زەرەری کەم قایل بە بۆ ئەوەی لە زەرەری گەورە

دوور بکەویتەوە".

لە هوەیدی دەپرسم بۆچی ئەوها نەبێ "مەرگیان پیشان بدە بۆ ئەوە بە تا رازی بن" سەیرم بەو بیرکردنەوە دێ بۆچی چیکۆسلۆڤاکیا کە هەم "غەیرە دین" هەم "بێ-دین" بوون بێ کێشە بوونە دوو دەوڵەت! بۆچی ئەگەر کورد داوای "فیدراڵی" نەك "دەوڵەت" بکات دەبێ قایل بێ، ئەگەرنا خراپتری بەسەر دێ. بۆ عەرەب دەوڵەتی هەبێ، کورد نەیبێ. پێغەمبەر(د.خ) نافەرموێ: ئیمانت تەواو نابێ ئەگەر چت بۆ خۆت پێ خۆشە بۆ براکەشت پێ خۆش نەبێ"؟!

فیدراڵی کوردی بەشێکی تری وتارەکەی هوەیدییە. کورد لەگەڵ ئەوەدایە کە شێوازی فیدراڵییەکەی جیاواز بێت و هەموو کوردستانی بگرێتەوە. هەرچەندە لە دەستووری کاتی عێراق کە ناسراوە بە یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت، ئاوا لە فیدراڵییەت نەدراوە. دەسەڵاتی کوردی تاکە دەسەڵاتە لە هەموو عێراق کە ئیدارە و یاسا و سوپای هەبێت، کەچی هەر ئەو دەسەڵاتە نەیهێشت عێراق دابەش بێت. خۆ ئەگەر هەر لەگەڵ رزگارکردنی کەرکووك کورد یەك ڕاو یەك ئاڵا بوایە ئێستا عەرەبێکی هاوردە لە کەرکووك نەدەما و فیدراڵی کوردی هەرچوار شاری دەگرتەوە نەك تەنیا سێ شار! مەسەلەی عەرەبیێتی کەرکووکیش سنووری عێراقی نەدەبەزاند، بەڵام چ لەگەڵ دوو دەسەڵاتی کوردی دەکەی کەسێکی

وەك یلوەر و عەلاوی پێیان بڵێ کەرکووك بدەینە کامەتان؟

لەکۆتاییش هوەیدی خەمی ئەوەیەتی کە بۆچی کۆمکاری عەرەبی لە بەرامبەر ئایندەی دەوڵەتی عێراق و یەك پارچەیی عێراق بێدەنگە و تەنها تورکیا لەسەر ئەو مەسەلەیە بەدەنگە؟

ئەریّ کۆمکاری عەرەبی بێجگە لە "دمیە"یەك کە بێجگە لە بێدەسەڵاتکردنی جەماوەری عەرەبی چیترە؟ چارەسەری چی بکات؟ عەرەب ئەگەر کۆمکاری عەرەبی بە مەرجەعیەتی خۆیان بزانن لەوە زەلیلتر دەبن! هەرچی تورکیایە، ئەو چاك دەزانێ: "کێنەدەرێی دێشێ"! ئەو خەمی چارەشی عەرەبی عێراقی نییە، بەڵکو لەوە دەترسێ چارەنوسی وەك چارەنوسی سەدام و سەدامییەکانی رۆژهەلات بێ! □

سەرنج: ئەو وتارەی هوەیدی لە رۆژنامەی "الشرق الأوسط" بلاوکراوەتەوە، کوردیییەکەش لە ژمارە (٥٣٠) گولان بلاوبۆتەوە.

# کورد لە ئەفسانەی ناسیونالیزمی دا

کە چاوێك بە مێژوی کۆن و نوێ و هاوچەرخی کورد دادەگێرین، دەستبەجێ پرسیارێك خۆی دەسەپێنێت، ئایا کورد نەتەوەیە؟! ئەو پرسیارەش لەخۆڕا دروست نابێت، بەڵکو ئەو هەموو شێواندن و گچکۆڵە کردنی دەوری کورد لە مێژوی ڕێنیسانس و شارستانی ئیسلامی و ئێرانی لەلایەك، نەبوونی کیانێکی سیاسی ـــ نەتەوەیی و پاشاگەردانیو فەشەل هێنانی شۆڕشەکانی کورد لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی دا بۆتە هۆی خولقاندنی ئەو پرسیارەو، کاریگەریەکی خراپی لەسەر سایکۆلۆژی، هەتا ئایدیۆلۆژی تاکی کورد بەجێهێشتووە!

دروستکردنی ئەو بارە ناکۆکە لەلای کوردان ، شتێکی سروشتیيە، چونکە دوای داتەپین و هەرەس هێنانی دەوڵەتی (ماد) ، ساسانیەکان هەوڵیان داوە نەك کوردان وەك کۆمەڵێك لەنێو خۆیاندا بتوێننەوە، بەڵکو هەتا دەستیان لە فەرهەنگو ئایینی کوردیش وەرداوە! دوای هەردوو داگیرکردن و دابەشکردنەکەی تر بە تایبەتی بەرنامە ئیمپریالیيەکەی (سایکس بیکۆ) و (لۆزان) جارێکی تر کوردیان وەك نەتەوەیەك لە بەردەم ڕمانێکی حەتمی سیاسی و ئاینی دانا، ئەو هەوڵە

ئیمپریالیه واتای ڕەتکردنەوەی قەوارەی سیاسی کورد و، هەروەها به کۆڵۆنی کردنی نیشتمانەکەی بوو..

دروست بوونی چەند دەوڵەتێکی شۆڤێنی لە ناوچەکەدا و دابڕین و دابەشکردنی کوردستان بە سەریاندا مەسەلەی بوونی نەتەوەیی کوردی ئاڵۆزتر کرد، چونکە هەریەك لەو دەوڵەتانە هەم هاوسێ و هەم بەناو هاو ئایینی کورد بوون، هەروەها هەریەك لەم نەتەوانە پێشتر نەتەوەی باڵادەستی ئیمپراتۆرییەکانی رۆژهەڵات بووینە، جا ئەو نەتەوانە بەپێی پەیڕەوو پڕۆگرامێکی ئیستعماری. بوونی نەتەوەیی کوردیان نکوڵی لێ کردووە، جاڕی تواندنەوەی کوردیان بە پرۆسەیەکی سروشتی و خۆهیشتی غیبی داوە! وەك بڵێی کوردی بوون گوناهێکی گەورە بووبێت.. هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد هەوڵی تواندنەوەی کورد بەشێوەیەکی دبلۆماسی هەر لەدوای دابەشکردنی جاری دووەم دەستی پێ کردووە. ئەو هەوڵە ئیستیعماریە ئایینی پیرۆزی کردۆتە دەسکەلای خۆی، بە حوکمی ئەوەی پێکهاتی کورد پێکهاتێکی ئایینی هەڵکەوتووە!

بەڵێ لەو سۆنگەوە تورکێك بە نێوی خواجە سەعدەدین ١٥٣٧ – ١٥٩٩ پەرتوکێکی بە نێوی (تاج التواریخ) نووسییەوە، ئەفسانەیەکی ئایین ئامێزی لە سەر تواندنەوەی هەستی کوردایەتی و ئایینی تێدا داتاشیوە شەرەفخانی بەدلیسیش لە پەرتووکە مێژوویەکەیدا (شەرەفنامە)، دەقی ئەو ئەفسانەیەی تۆمار

کردووە، وەکو دەڵێت گوایە: (پێغەمبەری ئیسلام دوعای لە کورد کردووە کە هیچ کاتێك یەك نەگرن، چونکە یەکبوونی کورد دەبێتە هۆی تێکدانی هەموو جیهان، هەر لەبەر ئەوەشە کە کورد لەوساکەوە تا ئێستاش نەیانتوانیوە دەوڵەتی مەزن و فەرمانڕەوایی گەورە دامەزرێنن.[1]

ئەفسانەیەکی دی هاومەبەست لە کوردستانی باشووردا بڵاوە، ئەویش ئەوەیە: (کورد لەو قەومانەن کە گوێڕایەڵی قسەی نەمروود بوون داریان کۆ کردۆتەوە بۆ سوتاندنی ئیبراهیم پێغەمبەر لە مەنجەنیقەکەی نەمرووددا، هەر لەبەر ئەوەشە خوا نەفرەتی لە کورد کردوە، دەبێت هەر بە ژێردەستەیی و پەرتەوازەیی بژین!).

ئەو هەوڵدان و کردن بە عەرەبەو خولقاندنی گیانی یاخی دژ بە ئاین لە یەککگرێدانی هەوڵێکی کۆن و نوێیە. مەسعودی لە پەرتووکی(مروج الژهب) دا باسی نەژادی کورد ئەوەندە بە ڕق و قینەوە دەکا، مەگەر ئەو وەسفە هەر لەخۆی بێت، کە دەڵێت: کورد لە ئەجندە لاسار و بەدرەوشتەکانی حەزرەتی سلێمان وەپاش کەوتوون.[2]

خەیروڵڵا تەلفاحی نووسەری (بەعسی ئیسلامی!) دەڵێت: (ئەوی باوەڕ بەوە نەکات کە ڕەگەزی عەرەب لە هەموو ڕەگەزێکی دی بەرزترە: ئەوکەسە لە شعوبیە دەمار پیسەکانەو،

کردووە، وەکو دەڵێت گوایە: (پێغەمبەری ئیسلام دوعای لە کورد کردوە کە هیچ کاتێك یەك نەگرن، چونکە یەکبوونی کورد دەبێتە هۆی تێکدانی هەموو جیهان، هەر لەبەر ئەوەشە کە کورد لەوساکەوە تا ئێستاش نەیانتوانیوە دەوڵەتی مەزن و فەرمانڕەوایی گەورە دابمەزرێنن.[1]

ئەفسانەیەکی دی هاومەبەست لە کوردستانی باشووردا بڵاوە، ئەوەیش ئەوەیە: (کورد لەو فەرمانەن کە گوێڕایەڵی قسەی نەمروود بوون داریان کۆ کردۆتەوە بۆ سووتاندنی ئیبراهیم پێغەمبەر لە مەنجەنیقەکەی نەمرووددا، هەر لەبەر ئەوەشە خوا نەفرەتی لە کورد کردوە، دەبێت هەر بە ژێردەستەیی و پەرتەوازەیی بژین!).

ئەو هەوڵدان و کردن بە عەرەبەو خولقاندنی گیانی یاخی دژ بە ئاین لە یەککگرێدانی هەوڵێکی کۆن و نوێیە. مەسعودی لە پەرتووکی(مروج الذهب) دا باسی نەژادی کورد ئەوەندە بە ڕق و قینەوە دەکا، مەگەر ئەو وەسفە هەر لەخۆی بێت، کە دەڵێت: کورد لە ئەجندە لاسار و بەدرەوشتەکانی حەزرەتی سلێمان وەپاش کەوتوون.[2]

خەیروڵڵا تەلفاحی نووسەری (بەعسی ئیسلامی!) دەڵێت: (ئەوی باوەڕ بەوە نەکات کە ڕەگەزی عەرەب لە هەموو ڕەگەزێکی دی بەرزترە: ئەوکەسە لە شعوبیە دەمار پیسەکانەو،

شعوبیه‌کانیش نەویترین بەندەی خودێن.[٣]

لە سوریای بەعسی شۆفێنیشدا هەمان بیرو بۆچوونی دەمارگیری ڕەگەزپەرستی لە قوولکردنەوە و دوورخستنەوەی ئیسلام و کورد لە ئارادایە. (مونزیر ئەلموسلی) ئەندامی بەرزی دامودەزگای بەعسی سووری لە چاپی یەکەم ١٩٨٦ و دووەمی ١٩٩١ لە پەرتووکی (عرب واكراد رؤية عربية للقضية الكردية) ئەفسانەیەکی دی دەستکردی واهیمەی بەعسی عەرەبی لە (ل٢٩٩-٣٠٠) پەرتووکەکەیدا تۆمار دەکات: (ان الله وزع اللغات على شعوب الارض فلم يبقى شعب الا وحظي بلغة اختص بها الا الشعب الكردي، واذ حار الاكراد في الامر فانهم توجهوا الى الله يشكون اليه حظهم السئ ويطلبون لانفسهم لغة خاصة بهم، فأجابهم الله بأنه لم يبق في السماء من اللغات فائضة، مشيرا عليهم ان ينتقوا من كل لغة ما يشتهون و يرغبون.. وهكذا كان، لذلك جاءت لغتهم خليطا وعديدا من اللهجات) بەو شێوەیە داگیرکەران، دیماگۆجی خۆیان لە بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆیان دژ بە ئیسلام و کورد بڵاودەکەنەوە، دەیانەوێ شوێنەواری داگیرکردنی کوردستان و داگیرکردنی فیکری و سیاسی و ڕۆشنبیریشی بخەنە پاڵ....

لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتیش بە نێوی هاو ڕەگەزی و ئایینی هێرشێکی فرەگەورە و شاراوە لە ئارادابوو.

ڕەزاشای پەهلەوی کە لە بیستەکانەوە کۆتایی بە فەرمانڕەوایی

قاجاری هێنا، دەستی کرد بە بەفارسی کردنی مێژوو و فەرهەنگی گەلانی ئاری غەیرە فارسی، ئەو هەوڵە لـە ڕووی دەرەوە شـاراوەیە، بەڵام لە ناوەوە زۆر زەق و بەرچاوە، ئەو کـە دەیـووت (ئێـران) لـە ناوەوە مەبەستی پێی نەتەوەیی (فارس) بوو، بەڵام لە دەرەوە وشەکە واتای (وڵاتـی ئـاری یـان) دەگەیـەنێت! دەسـەڵاتدارانی ئێـستاش هەمان بەرنامە پەیڕەو دەکەن بەوەی بەهیچ جۆرێك ناهێڵن خوێندن لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی خوێندن لە کوردستان بە کوردی بێت هەتا لە هەشتاکان (جیهـاد) یـان فـەرزکرد لەسـەر کـورد هەروەك چـۆن سـەدام هێرشـی بـە کۆمـەڵ کوشـتنی ١٩٨٨ بـە (ئەنفال) ناودەبرد! ئەو هەوڵانەش نکۆڵی کردن و تواندنەوەی بوونی کورد و زڕاندنی بیری ئایین تا ڕادەیەك دەوری خۆی بینیوە و دروست بـوونی ئـەو هـەموو ڕێکخـراو و پارتـە سیاسـی یـە مارکـسی و دیموکراتی و ناسیۆنالیزمی یە گەواهی ئەو ڕاستیە ڕەهایە دەدەن.

ئەوان بە ناوی دینەوە دەدوێن، بە ناوی دین هەوڵ دەدەن (کوردی بوون) نەهێڵن و، فارسی، تورکی عەرەبی، بـوون بـە پرۆسـەیەکی غەیبی و خۆهێشتی دابنێن، جا بزانین هەڵوێستی ئـایینی ئیـسلام سەبارەت بەو مەسەلەیە چی دەڵێت؟! ئایـا کـورد ئەجندیـە؟!یـا مرۆڤە بە پێی بەرنامەی خوا؟! ئایـا (کـوردی بـوون) گونـاهێکی غەیبی یە؟ ئایا نەبوونی قەوارەی سیاسـی کـورد و پاشـاگەردانی شۆڕشەکانی کورد، دوعای پێغەمبەر و نەفرەتی خوایی یە؟!

ئایدۆلۆژیا و بنـەماکانی ئیـسلام ڕوون و ئاشـکران ، هـەر بـۆ نموونە سەبارەت بە یەکسانی ڕەگـەزی مـرۆڤ و فرەنەتـەوە و گـەل، خوای گەورە لە سورەتی (الحجرات)دا دەفەرموێ: ﴿ يأيها الناس انـا خلقناكم مـن ذكـر وأنثى وجعلنـاكم شـعوبا وقبائـل لتعـارفوا إن أكرمكم عندالله أتقاكم ﴾ لە سوڕەتی (الـروم)یـشدا دەفـەرموێت: ﴿ومن آياته خلق السموات والارض واختلاف ألسنتكم وألـوانكم ان في ذلك لآيات للعالمين ﴾ بەر لە هـەموو شـتێك خـوای گـەورە نافـەرموێت (ئـەی عـەرەب، تـورك ، فـارس، کـورد..) بـەڵکو دەفەرموێت: ئەی گەلۆ ـــ خەڵکینـە ـــ وە نافـەرموێت ئـەوەی عەرەب نەبێت لە ڕەگەزێکی نزمترە ! بەڵکو دەفەرموێت (هـەموو لە نێرو مێیەك وەپاش کەوتوون، ئـەویش لـە گـڵ دروسـت بـووە) بـەرزی گروپێـك بەسـەر گروپێکـی تـر بـە پێـوەری قـەومی و ڕەگەزپەرستی، هەروەك شۆفێنیەکان حسێبی بۆ دەکـەن، حـسێبی بۆ ناکرێت ، بەڵکو بـەڕێزترین گـەل و نەتـەوە ئەوکەسـانەن، کـە ملکـەچ و گوێڕایـەڵی فەرمایـشتەکانی خـودێن.. لەوبارەیەشـەوە پێغەمبەر (درودو سـەلامی خـوای لێبـێ) لـە (حجـە الـوداع) فەرموی: (هیچ عەرەبێـك بۆی نی یە خۆی لە غەیرە عەرەبێك پێ باشتر بێت بە تەقوا نەبێت، هەروەها هیچ غەیرە عەرەبێکیش بـۆی نی یە خۆی لە عەرەبێك پێ باشتر بێت بە تەقوا نەبێت).

لەو چەند ئایەت و فەرموودەیە دەفامرێتـەوە، کـە تواندنـەوەی

کورد له بۆتەی عەرەبیتی، تورکایەتی و، فارسیتی، پرۆسەیەکە دژ به جەوهەری ئایینی ئیسلامە، هەروەك چۆن عەرەب بوون شتێکی سروشتیو خواکردەیه به هەمان شێوه کوردبوون کارێکی سروشتی و خواکردەیه! داکۆکی کردن لەسەر ئەو مەسەلەیه نەك هەر گوناه نیيه، بەڵکو کارێکی پیرۆز و بەجێیه، بەمەرجێك ئەو داکۆکی کردن و بەرگری کردنه کوێرانەو نامرۆڤانه نەبێت!

کەوابێت له سۆنگەی ئیسلامەوه کورد وەك هەر نەتەوەیەکی دی نەتەوەیه و خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی هەیه، ئەمەش حەقیقەتێکی دی بوونی خوایيیه، ئەمڕۆش له چەرخی تەکنەلۆژیاو مافی مرۆڤ و دیموکراسیيەتدا چەند بنەمایەك دانراون وەك مەرجێك بۆ به نەتەوەبوونی کۆمەڵێك!

با بزانین به پێی ئەو بنەمایانه کورد نەتەوەیه؟ مافی نەتەوەیی خۆی هەیه؟ بۆی هەیه خۆی بڕیاری چارەنووسی خۆی بدات؟

دکتۆر (ستاروشنکۆ) لەو بارەیەوه دەنووسێت:

نەتەوه ئەو کۆمەڵه خەڵکانەن که به درێژایی مێژوو دروست بوون و جێگیر بوون، بنەماکانی نەتەوەش زمان و خاك و ئابووری هاوبەش و ژیانی سایکۆلۆژی هاوبەشن،[٣] زانای بولگاری (ئیڤانۆڤ) قوڵتر به ڕەگ و ڕیشەی مەسەلەکەدا دەچێتەوه خواریّ و پێناسەیەکی تێرو تەسەلتر دادەڕێژێ و دەڵێت: ( میللەت له کۆمەڵه خەڵکێك پێکهاتووه که خاوەنی یەك هەڵس و کەوت بن،

چ له لەش و لار و، چ له بارەی دەروونیا، یەك نەریت بیانگرێتەوە و ئامانجیشیان یەك بێ.. ئەو ڕەگەزانەی کە هەڵس‌وکەوتی نەتەوەیەك پێك ئـەهێنن و ئـەیپارێزن ئەمانـەن: یـەکێتی ڕەگـەز، سـنووری جوگرافی، زمـان، ئـایین، وێـژە (ئـەدەب) کەلـەپوور، بیروبـاوەڕ و چۆنیەتی ژیان، یـەکێتی ڕامیـاری ، مێـژووی هاوبـەش هـەروەها هاوبەشی له ڕێڕەوی ڕۆشنبیری دا.[٥]

هەریـەك لـەم دوو پێناسـەیەدا مـەرجێکی بنـەڕەتی بـە نەتەوەبوونی کۆمەڵێك دەسەلمێنێ ئەویش هەستی خۆرسکی خۆ بە نەتەوەزانینە له نێو تاکەکانی کۆمەڵ، دوایی کۆمەڵ خۆی.

هەر بۆ نموونه هەست به کوردی کردن بڕبڕەی بـوونی نەتـەوەیی کورد دەسەلمێنێت، هەرکاتێکیش ئەو هەسـتە لـەنێو بـچێت ئـەو قەوارە و بوونە قەومیەش لەنێو دەچێت، بـەپێی بەڵگـە ئـایینی و بەرجەستەکان کورد نەتەوەیە و خاوەنی زێدی تایبـەتی خۆیـەتی و بەجۆرێك نیـشتمانەکەی بـە لانکـی مرۆڤایـەتی دووەم دادەنرێـت هەروەك قورئانی پیرۆز ئامـاژەی بـۆ کـردووە و بـە بەڵگـەش ئـەو ڕاستیە ئەمرۆکە ڕوون بۆتـەوە! هـەروەها هـەر بـە دەقـی قورئـان کوردستان وڵاتێکی پیرۆزە وێڕای بە کۆلۆنی کردنی کوردستان کـە بۆتە هۆی دواکەوتنی کورد لـە بـواری سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و ئابووری و ڕۆشنبیری بەرامبەر بە نەتەوە باڵادەست و داگیرکـەرانی، بەڵام داب و نـەریتی کوردانـە، مێـژوویکی تایبـەتی و زمـانێکی

زیندوو و ڕەسەن بەڵگەی بوونی ئەو نەتەوە ڕۆژهەڵاتیە دەگەیێنن.

هەر ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندێتی نەتەوەیی کوردە، فەلسەفە و تێڕوانینێکی جیاو تایبەت بە سروشت و پێکهاتی قەومی کوردی دروست کردووە، ئەگەر بێتو بەراوردێکی خێرا لەنێون بیرو تێڕوانینی کورد لەگەڵ داگیرکەرانی بکەین، ئەو ڕاستیەیە زیاتر ڕوون دەبێتەوە. بە پێی تێڕوانینی کورد کە لە ئەزموونی چەند ساڵەی ژێر دەستەیی و پێکەوە ژیانی لەگەڵ عەرەب، تورك، فارس، فرچکی گرتووە و نەش و نمای کردووە، نەتەوە پەرستی عەرەب، تورك، فارس، هەست و بیرێکی دوورەگی و ئیستعمارییە.

هەر یەك لەو نەتەوانە بەشێك لە خاکی کوردیان داگیر کردووە و، بە هی خۆیانی دەزانن، تواندنەوە و سڕینەوەی ناسنامەی قەومیی کورد بە شتێکی زەروری و بە بەشێك لە فەلسەفە ڕەگەز پەرستیەیەکانیان دەزانن، بوونی قەوارەیەکی قەومیی کورد بە خەتەرناك و هەڕەشە دەدەنە قەڵەم، هەروەك دکتۆر ئیسماعیل بێشکچی دەنووسێت: (نەتەوەپەرستی کورد لە گەوهەردا لە ڕێبازیدا هیچ دوژمنایەتیەکی تێدا نیە، بەلام نەتەوەپەرستی تورك و عەرەب و فارسەکان دوژمنکارن، سروشتی بزوتنەوە نەتەوەییەکانی تورك و عەرەب و فارس ناوەڕۆکێکی ئیمپریالیستی و ئیستعمارییان هەیە، تەواو بە پێچەوانەوە، نەتەوە پەرستی کورد هەوڵ دەدات لە ئیستعمار و بزووتنەوەکەی ڕزگاری ببێت یەکسانی

لەگەڵ تورك و عەرەب و فارسدا ئامانجیەتیو تێدەکۆشێت کورد لە هێرش و دڕندان دەرباز بکات).[٦]

هەر لە ڕوانگەی ئەو داگیرکردنەوەوە سروشت و تێڕوانینی کوردیی لەگەڵ هەمبەرەکانی قوڵتر دەبێتەوەو، هەریەکەی خانەیەکی لەخۆ جیایی دادەگرێت.

بەپێی ئایدۆلۆژیا و تێڕوانینی کوردیی پەیمانی سیڤەر ١٩٢٠ جاڕدانی قەوارەی نەتەوەیی و، سەربەخۆیی کوردی دەگەیاند، کەچی هەمان پەیمان لە ڕوانگەی بیری تورکایەتیەوە (سێدارەی تورك) دەگەیەنێت، ئەو پەیمانە لەگەڵ پەیمانی (لۆزان)دا هەڵچوون و داچوونێکی ناکۆك دەخولقێنێت، چونکە (کورد، پەیمانی لۆزان، ٢٣ ی تەمووزی ١٩٢٣ تەواو بە کۆیلەیەتی دادەنێت، کوردستان بەپێی ئەم پەیمانە، لە نێوان چەند دەوڵەتێکدا دابەش و پارچە پارچە کراو، کوردیش دوچاری کۆیلەیەتیەك کرا، کە لە هیچ شوێنێکیتر وێنەی نیە، بەڵام ڕێکەوتنی لۆزان لای تورك مانایەکی تری هەیە. لۆزان بۆ ئەوان سەربەخۆیی و بیناکردنەوە دەگەیەنێت.[٧] هەردوولا بە ڕواڵەتی مەسەلەکە هەڵخەڵەتابوون، ئەگەرنا هەروەك چۆن لە ڕووی نەتەوەییەوە لۆزان لە ئەمری واقیعدا کۆتایی بە هەموو شتێ هێنا، بۆ تورکەکانیش هەروا کەوتەوە. ئەوە دیدی ناسیۆنالیستیە ئەو وەهمەی لەلای هەردوولا دروستکردووە.

ڕێکەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ دان نان بوو بە بوونی نەتەوەی کورد، بەڵام هەمان ڕێکەوتن لە ڕوانگەی بیری بەعسیەکانەوە ملکەچی و بێ دەستەڵاتی عەرەبی دەگەیاند.

پەیمانی جەزائیر، ٦ی ئازاری ١٩٧٥، وێنەیەکی دی لۆزان بوو، بەڵام بە پێی فارسەکان سەرکەوتنێکی مەزن بوو، چونکە هەم هەرەس و شکستی بە شۆڕشی کورد هێنابوو، هەم لە لایەکی دییەوە، دابڕینی بەشێکی ستراتیژی خاکی عێراقیشی بەدواوە بوو!(٨)

لەو چەند دێڕەوە دەردەکەوێت کە کورد نەتەوەیەو، خاوەن خەسڵەت و تایبەتمەندێتی و ، مێژوو و زمان و کەلەپوور، کەلتوری خۆیەتی و بەو پێودانگەوە هەروەك نەتەوەیەك مافی چارەی خۆنووسینی خۆی هەیە هەروەك لەو بارەیەوە دکتۆر (فوئاد ساکۆ) ڕای دەگەیەنێت: (کوردەکان هەموو بەڵگەیەکی یاسایی و نێودەوڵەتیان هەیە بۆ داکۆکی کردن لە مافە نەتەوەیی و سیاسی و ئابوورییەکانیان). لەگەڵ ئەو هەموو ڕاستییە دینی و یاساییەدا ناسیۆنالیستی عەرەبی لە عێراقی سەدام و دوای سەدام هێشتا کورد بە نەتەوە ناخوێنێتەوەو هیچ مافێکی پێ ڕەوا نابینێ! □

* * *

**سەرچاوەکان:**

١) شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، تەهران ١٩٨٢.

٢) برادەرێك کە بۆ ماوەیەکی زۆر دیلی ئێران بوو بۆی گێڕامەوە کە کاربەدەستانی ئێستای ئێران لە موحازەرەکدا هەمان شتیان دەربارەی نەژادی کورد گوتووە. هەروەها زۆربەی رۆژهەڵاتناسەکان بە سادەیی‌و خراپی لە کۆمەڵی کوردەواری دواون و، بە جەردەو رێگرو هەزاران ناو و ناتۆری دی باسی کوردیان لە کتێبەکانیاندا بڵاوکردۆتەوە.

٣)جەمال نەبەز، دکتۆر، بیری نەتەوەیی کورد نە بیری قەومی رۆژهەڵاتی یە، نە بیری ناسیۆنالیزمی رۆژئاوای یە.. ١٩٨٤.

٤) رۆژنامەی مافناس ژ(؟) ١٩٩١.

٥) کادر، گۆڤار، ژ (٢) ی حوزەیرانی ١٩٩٢. ل٧٨.

٦) ئیسماعیل بێشکچی، کورد و مەسەلەی کورد: ل٤٥.

٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦ـــ٢٧.

٨)عەرەبیێتی نوێ بیرێکی سروشتی نی یە، بەڵکو دەتوانین بڵێین دووڕەگی یە هەروەك جۆرج ئەنتۆنیۆس لە (یقظه العرب) دەنووسێ: (بیری نەتەوەیی عەرەب لە ژێر چاودێری ئەمریکا بەهۆی بوونی جامیعەی ئەمریکی لە لوبنان لەلایەك و، کاریگەری بزووتنەوەی تەبشیری لەلایەکی دی یەوە هاتۆتە کایەوە. بانگی هەق ژمارە(١) ل١٠، هەروەها تورکێتی تورکە لاوەکان تۆرانیەتی کەمالیەکان لە

پاریس و سلانیك لەسەر ویستی یەهۆدی یەکان نەش و نمای کردووە. فارسێتی ڕەزاشاش لەگەڵ سەرهەڵدانی نازییەت لە ئەڵمانیادا بەرە بەرە ڕەگ و ڕیشەی داکوتی یە، هەروەك دەزانین ناسیۆنالیزمی ئینگلیزو یەهودی ــ جوو ـ و، ئەڵمانی هیتلەری بیرێکی ئیستعمارین دەیانویست لەسەر حسێبی نەتەوەکانی دی جیهانێکی نوێ بۆخۆ دروست بکەن و تەواوی بەشەریەت بە کۆیلە و بەندەی خۆ دابنێن.

لەو بارەیەوە دەمەوێت ئاماژەیەك بۆ بیری ئیستعماری ئینگلیز بکەم، کە لە چەند دێرِ هۆنراوەیەکدا شاعیرێك کە ناوی (برووك)ە بڵاوی کردۆتەوە:

(ئەگەر مردن بەگژم داهات
تەنیا ئەوەندە منتان وەبیربێت:
چەند گۆڕێك (گۆڕی سەربازانی ئینگلیز) لە کێڵگەکانی بێگانەدان
ئەوانە هەتا هەتایێ خاکی ئینگلیزن (بڕۆك هۆنراوەی Thu Soldier).

هەروەها دکتۆر ئۆسکار لیڤی سەبارەت بە خودی یەهودی دەڵێت: (ئێمەی یەهودی گەورەی جیهان و تێکدەری ئەوین، هەروەها بزوێنەری بەڵاو جەلادی وین (اثر الأقلية اليهودية في سياسة الدولة العثمانية تجاه فلسطين).ل۱.

ناسیۆنالیزمی هیتلەرییەکانیش هەموو داب و نەریتێکی گەلانی غەیرە ئاری بە چاوێکی نزم تەماشا دەکەن، ئەو تێڕوانینە ڕەگەزپەرستییە دەقاودەق لەگەڵ تۆرانیزمی کەمالیەکان تێک دەکەنەوە.

تێبینی/ ئەم وتارە خۆی لەساڵی ١٩٩٢ نووسراوە، لە ژمارە (٧٢)ی (پەیامی ڕاستی) بڵاوکراوەتەوە.

# ڕۆژنامەگەریی کوردی لەنێوان ئازادبوون و وابەستەبووندا

حوکومەتکاری یاخود خۆ بەڕێوەبردن دیاردەیەکی تونیە لەنێو ئێمەدا. حوکمدارییەکەی شێخ مەحمود سەرەتایەکی ئەو فەرمانڕەواییە نوێیەی کوردییە. ئەوسا هەر حکومەت نەبوو، ڕۆژنامەگەریش هەبوو، ڕۆژنامە هەبوو ئازاد بوو! هەشبوو زمانحالی حوکمدارییەکە بوو! لەپاش هەرەسی یەکەمی شێخ. مێجەرسۆن یەکەم کەس بوو یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لەسەر خاکی کوردستان دەریکا. ڕۆژنامەکە ناوی (پێشکەوتن) بوو. دەرچوونی ڕۆژنامەکە خۆی لەخۆیدا بۆ زیاتر شکاندنی خێوی دەسەلاتی شێخ بوو. هەر ئەو ڕۆژنامەیە و هەندێ ڕۆژنامەی تر زۆر نووسەر و ڕۆناکبیری دژەشێخی لەخۆکۆکردەوە. ڕۆمانی (لەخەوما)ی جەمیل صائب یەکێ لەو نووسینانەیە کە لەدژی دەسەلاتی شێخ نووسراوە!!

لە کوردستان دیاردەی "ئازادبوون و وابەستەبوون" لەوساوە لەنێو ئێمە سەریهەلداوە. ئەوانەی وابەستەی دەسەلاتی شێخ نەبوون هەموو "پاك" نەبوون. هەبوو وابەستەی "ئینگلیز!" بوو، هەبوو وابەستەی "تورکیا!" بوو لەمێژوودا بە جلخۆر ناسراون، هەشبوو

وابەستەی دژزی میللەتەکەی بوو لەهیچ بەرەیەکی دەسەڵاتەکان نەبوو!!

لەدوای راپەرینی بەهاری ۱۹۹۱ نەك حکومەت، کورد پەرلەمانیشی دروست کرد. بێگومان حکومەت و حیزب بۆ داکۆکی لەبوونی خۆیان دەزگایەکی راگەیاندنی مەزنیان دامەزراندووەو بەسەدەها نووسەر و "روناکبیر"یان لەخۆ کۆکردۆتەوە. ئەوانەی وابەستەی دەسەڵاتن هەندێ جار لە چەکدارێك خراپترن دیماگۆژیانە مامەڵە لەگەڵ رەوشی وڵات دەکەن، بۆیە هەر خەڵك ناکوژن وەك چەکدار، بەڵکو ستراکتۆری ماڵوێرانی لە بونیادی دام و دەزگای حکومەت و حیزب دەچێنن!!

مەرج نییە ئەوانەی بەناو "ئازادن!" لەگەڵ وابەستەکان یاخود وەك دکتۆرێکی برادەرم دەڵێن "دابەستەکان!" تەوفیرێکی ئەوتۆیان هەبێت!!

ئەوەی وابەستەیە، بەر لەوەی هەر شتێ بێ فەرمانبەرە لە حیزب ئەوجا حکومەت. حیزب و حکومەت هەرچی بخوازێ دەبێ هەر ئەوەبێ. هەر ئەو حاڵەتەشە وای لە هەندێ کەسی حیزبی یاخود وەزیر کردووە هیچ رێزێك بۆ "قەڵەم" دانەنێت. ئەو چاکدەزانێ "قەڵەمدار" وا دەم چەورکراوەو هەروەها وا تەلقین دراوە بزانێ هێڵی سوور هەیە! جا لەوانەیە ئەو هێڵی سوورە هێندە بچووك بێ، چۆن مدیرێك فەرمانبەرێ غائیب دەدا ئەگەر (دە

دەقیقە) دوابکەوێ یان وەك ئەو مامۆستایەی کە هەر پرسیار لێکردنێك بەزاندنی هێڵی سوورە لەلای!! ئەوهابێ!!

هەندێ جار دەسەڵات یاخود حیزب لەنێو وابەستەکاندا کەسانێك تەمویل دەکا رۆژنامەیەکی "ئازاد" دەربکا. ئەو وابەستە ئازادانە لە هەموو شتێ ئازادن تەنها زەرەریان بۆ پەزەکە نەبێ. دروستکردنی ئەو کەسانەش چەندەها مەرامی لەدواوەیە. ئەوەی حیزب ناتوانێ لە رۆژنامەی رەسمی بیڵێ، لەو رۆژنامەیە بە زاری ئەو رۆناکبیرە دەیڵێ! لەمەشدا حیزب هیچ بەرپرسیاریەتی رەسمی ناکەوێتە ئەستۆ. هەر قسەیەکیش بکرێ "وەڵامی ئامادە" ئامادەیە!

لەو رەوشەی ئێستا باوەڕ ناکەم هیچ مەسئولێك لە دەرگای هیچ رۆناکبیرێك بۆ ڕاو تەکبیرێك بدات. حیزبدار و حکومەتدار ئەگەر قەڵەمیشی نەبێ دەسەڵاتی هەیە هەرچی قەڵەمدارە نە دەسەڵاتی هەیە و نە ترسی هەیە، بۆیە کەس لێی ناترسێ!!

من خۆم قەت بە موتڵەقی نائاخافم چونکە چاك دەرکم بەوە کردوە خەتی لە یەك جیاکەرەوەی نێوان "وابەستە" و "ئازاد"دا ئاسان نییە، دیاریکرێ. ئەوەی ئەوێ ڕۆژێ لە هەندەران دوژمنی سەرسەختی دەسەڵات بوو، لەژێرەوە پەیوەندی فەوقە تەبیعی لەگەڵ لوتکەی دەسەڵات پەیداکردووە. ئەو برادەرە هەندەرانیانە هەر خۆیان نادۆڕێنن بەڵکو متمانەش لە دەرونی تاکدا دەڕوخێنن.

هەندێ لەم حاڵەتانە وای لە تاکی کورد کردووە گومانی بەرامبەر هەموو کەسێ، شتێ، رۆژنامەیێ، هەبێ.. بە واتای بابای هەندەرانی هەر دۆڕانی خۆی لە بەرەکەدا ڕاناگەیەنێ و بەس بەڵکو گومانیش لە دەرونی تاکی کورد دەڕوێنێ دەسەلات و حیزبیش لەو نێوەدا بەشیان هەر "بردنەوە!" دەبێ.

هەندێ لە بەناو ئازادەکان کە لە گۆڕەپانی فیکردا دۆڕاون دێن بۆ ئەوەی دۆڕاندنەکەی خۆیان بشارنەوە رەخنە لە بیروباوەڕی خەڵك دەگرن، هەندێ بە ئاشکرا و هەندێ بە لابەلایی رەخنە لە دیاردەی "ئیسلامی سیاسی!" یان خودی ئیسلام و بە "تیرۆر!"ی لە قەڵەم دەدەن، لاسایی سەرۆکی ئەمریکا دەکەنەوەو جاڕ دەدەن: ئەوەی لەگەڵ ئەوان نەبێ تیرۆریستە! ناسریەکانیش بەجۆرێ تەعامولیان لەگەڵ نەیارانی خۆیان دەکرد، دەڵێی ئەمریکاش دەرسی لەوان وەرگرتووە. ئەوەی لەگەڵ ئەوان نەبوایە ئەوە لە یەك کاتدا یان بە شیوعیەت یان بە ئیخوانی تۆمەتباریان دەکرد.

وابەستە ئازادەکان لە رۆژنامەو گۆڤارەکانیاندا هەندێ مەسەلەی زۆر گرنگ و حەساس دەوروژێنن و بەشێك لە تەیاری ئیسلامی هەراسان دەکەن. ئەوان باس لە سێکس و سێکسی ئازاد و فرەژنی دەکەن، هەروەها زۆرجاران لە مەسەلە نیشتمانییەکاندا ئیسلامییەکان بە کەمتەرخەم تاوانبار دەکەن. من نازانم بۆچی بەشێك لە تەیاری ئیسلامی ترسی ئەو مەسەلانەی هەیە؟! لە

قورئاندا له چەندەها شوێن خوای گەورە وردترین حاڵەتی سێکسی باسکردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئاشکرا باسکردنی ئەو مەسەلەیە لە نەزەر کۆمەڵەوە شکاندنی ئادابی گشتی و "کەلتوری پیرۆز"ە، ئەو ورووژاندنە لە گوتاری ئیسلامیدا حزورێکی ئەوتۆی نییە.. بە پێچەوانەش ئەدۆنیس دەڵێ هەر کە ئێمە باسی ئەو شتە بکەین ئەوە رەخنەیەکی توندمان ئاراستە دەکرێ!

گرنگە نوسەری ئازادی هەقیقی خزمەتی فکر و ئایدیۆلۆژیا و عەقیدەی خۆی بکات لە ورووژاندنی مەسەلە سێکسییەکان نەك هەڵنەچێ بەڵکو بەشێك لە ڕاگەیاندنی بۆ ئەو مەسەلە حەساسە تەرخان بکا. پێم سەیرە وابەستە ئازادەکان بەوپەڕی حورپیەتەوە باس لە ئازادی سێکسی بکەن بڵێن "لەشفرۆشی" با ببێتە حاڵەتێکی ساخڵەم و جێ و شوێنی تایبەتیان بۆ تەرخانبکرێ و دکتۆریان بۆ دابنرێ نەك بەدزی لەم ماڵ و ئەو ماڵ بێ تۆ بە زمانی "جائیز نییە، شەرعی نییە" وەڵامی ئەم دیاردەیە بدەیەوە!! بەرامبەر لەم زمانە تێناگات، تۆ دەبێ بەرنامەت هەبێ و بە بەرنامەی خۆت دابچییەوە بزانی چارەسەر چییە؟! لەشفرۆشی بۆتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ڤایرۆسی خۆی لە تەواوی رۆژهەڵاتدا بە رێژەی جیاجیا بڵاوکردۆتەوەو خەریکە بەم بێدەنگییە وەك رۆژئاوای لێدێ!! ئەو بەو جۆرە لە فرەسێکسی دەدوێ بەڵام تۆ بە شەرمەوە یان وەك ئەو لە فرەژنی دەدوێی! بۆ نموونە لە کوردستان دەنگۆی ئەوە هەیە کە

بەرامبەر هەر پیاوێك هەشت ژن هەیە! من ئەوە زۆر بەڕاست نازانم بەڵام گومانم لەوە نییە کە بەرامبەر هەر پیاوێك دوو ژن هەیە. جا وەرە تۆ چارەت چییە وەك دۆڕاوەکان تەشجیعی فرەسێکسی نا تەبیعی دەکەی کە خۆی لە لەشفرۆشی ساخلەم نەوال سەعداوی گوتەنی دەکات؟! عەرەب و تورك و فارس لە ڕووی نەتەوەیی و هەتا دینییەوە زۆر ئازاری ئێمەیان داوە بۆیە لەگینە هیچ کوردێك ئامادە نەبێ کچی خۆی، خوشکی خۆی لە باشووری کوردستاندا بداتە عەرەبێك!! جا ئەمە ناکاو بە لەشفرۆشی ساخلەمیش ڕازی نییە، نازانم بۆ لای شەرمە تەشجیعی فرەژنی بکات کە کوڕ و کچی کورد، کە سامانی گرنگی نەتەوەن، لە ڕوخان ڕزگار بکات! پێم سەیرە زۆر نوسەری ئیسلامی وابەستەی حیزب لە ڕاگەیاندن هەند بە شەرمەوە باسی ئەو دیاردەیە دەکەن وەك بڵێی فرەژنی لەگەڵ فرەسێکسی وەك یەك بێ و تاوان بێ!![1]

[1] هەندێ (ژن) و (ئافرەت) خەریکی پرۆژەیەکن کە بەڕەسمی (فرەژنی) حەرام! بکرێ. خەمەکە ئەوەیە دەیانەوێ دەروێشەکانی خۆیان وا تەلقین بدەن، کە ئەمە پاراستنی مافی ئافرەتە!.. ئەمە بێ یەك و دوو هاندانی فرەسێکسی و فرەدۆستی لێدەکەوێتەوە، چونکە ئەگەر ڕێژەی کورد لە باشووری کوردستان پێنج ملیۆن بێ، ئەوا بەلای کەمی سێ ملیۆنی ئافرەتە. جا ئەگەر دوو ملیۆن پیاوەکە هەموو ژن بێنن، ئەوا یەك ملیۆن ئافرەتی کورد هەتا ماوە مافی مێردکردنی نابێ!! ئێمە (١٨) پاکیزەمان لە (مەلهاکانی میسر)ن وەختە لە هەژمەتان شێت ببین، ئەدی چارەنوسی ئەو ملیۆن ئافرەتە چی لێبکەین؟! کێ هەیە کچی خۆی بداتە عەرەبێك، تورکێك، فارسێك؟! ئێ

پێغەمبەر(د.خ) و یارانی هیچ کامێك تەنیا ژنێکی لەلا نەبووە هەر ئەوانیشن بۆ ئێمە بە سەرمەشق دادەنرێن و نەشمزانیوە لە هیچ ژێدەرێك ئەوان کێشەی هاوکێشەی جیلی ئێمەیان هەبووبێ!!

نازانم چ دینێك بەقەدەر ئیسلام تەشجیعی مەسەلە نیشتمانییەکان دەکات؟! کەچی زۆربەی تەیاری ئیسلامی عەرەبی قەبوولّی نەتەوەیەکی وەك کورد ناکات. هەتا فیدرالّیش بە دەستێکی ئەمریکی دادەنێن. من پێم سەیرە کە تەیاری ئیسلامی کوردی لە کوردستاندا بۆچی تەشجیعی دەولّەتی کوردی ناکات؟ ئایا جائیز نییە؟! دەبێتە بەشبەشکردنی ئوممەی ئیسلامی؟! ئەو قەرانانە زادەی عەقلّی تەیاری ئیسلامی-عەرەبین نەك قورئان و سوننەت.

بەکورتی دیاردەی وابەستەبوون و ئازادبوون هەموو تەیارێکی ولاّتی گرتۆتەوە. سەرچاوەی سەرەکی ئەو نەگبەتی و مالّوێرانییەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی حیزب لەپێش هەموو شتێکەوەیەو حکومەت هەر تەنیا کۆپی و لەیستۆکی حیزبە و نان هەر بەدەست حیزبەوەیە. مەسەلەی موئەسەساتی هەر جوینێکەو ئەوە پازدە

---

خۆ ئەو ملیۆن ئافرەتەش وەك هەر ئافرەتێکی تر مافی سێکس و خێزان دروستکردنی هەیە...! بۆیە ئەگەر دەسەلاّتی کوردی خەمی "ئافرەتی کورد"یتی، دەبێ لەپێناو (ناموس و کەرامەت و ڕێزی ئافرەتی کورد) هانی خەلکی بەڕێز و بەواتای وشە پیاو نەك نێری سێکسی بدات ژنێکی تر بێنێ نەك دۆستێك (ژنێکی ناشەرعی) تری هەبێ!!

ساڵە هەر کاوێژ دەکرێتەوە و بەنجی موخەدەرە لە عەقڵی تاکی کورد دەدرێ. لەو نێوەش لە زۆر حاڵەتدا ئازاد و وابەستە تێکەڵ بەیەک بوونە ئەستەمە بکرێ خەتێک لەنێوان هەردووکیان بکێشی...! □

# ئەرمەنییەکان دەیانویست
# کوردستان بکەنە ئەرمەنستان

باوەڕناکەم هیچ میللەتێك بەقەد کورد لێبووردەیی ئایینی هەبێت، بەدرێژایی موسڵمانبوونی کورد، کورد هیچ کێشەیەکی ئایینی لەگەڵ غەیرە موسڵمان نەبووە. ئەوەتە ئەم هەموو دیان(کریستیان) و جولەکە و ئێزیدیەی لە کوردستان هەن هیچیان رۆژێ لەرۆژان کورد لەرووی ئایینییەوە نەیچەوساندوونەتەوە. ئەو هەموو دیانەی لە شەقڵاوەو دیانە و هەریر و کۆیە و ئاکرێ و دهۆك دەژین بوونەتە بەشێك لە کۆمەڵگەی کوردستانی، بەجۆرێ هەندێکیان هەر خۆیان بە کورد دادەنێن.

'ئەمە ڕاستییەکی مێژووییە، ئەوەی لێرەو لەوێ باسدەکرێ، کە کورد کێشەیەکی ئایینی دەگەڵ کەمایەتییە ئایینیەکانی کوردستان هەبێت، ئەمە تەنها تەئویلێکی رۆژئاواییانەیە ئەگەر نا هەر ئاریشەیەك ڕووی دابێ سەد دەر سەد سیاسی بووە نەك ئایینی. نووسەرێکی وەك نورەدین وەیسی لە ژمارە (٢٤١)ی رۆژنامەی (میدیا)دا بە چاویلکەیەکی ڕەشی رۆژهەڵاتناسییەوە هەوڵ دەدا بەشێك لەمێژووی کورد بشێوێنێ، یاخود لەبەرچاوی نەوەی نوێدا

به قێزو بێزەلەتی بکا و بەجۆرێ ببێتە جێگەی سەرزەنشت و شەرمەزارکردن.

وەیسی سێ مەسەلە دەوروژێنێ: شەڕی میری سۆران لەگەڵ ئێزیدییەکان، کوشتاری ئەرمەن و بەمەسیحی بوونی هەندێ کورد.

وەیسی دەیەوێ بلێ پاڵنەری ئایینی (ئیسلامی) لەپاڵ ئەو شەڕەی میری سۆران بووە. یەکێ ئەو قسەیە دەکات کە میری سۆرانی نەناسیبێ. جارێ مەسەلەی شەڕەکە وەك لە سەرچاوەکاندا هاتووە، کاردانەوە بوونە نەك کردار. دەوترێ میر ئەو شەڕەی لەپێناو ئەو زوڵمە کردووە کە سەرانی ئێزیدی لە (مەلا یەحیای مزوری) و بنەماڵەکەیان کردووە. لەلایەکی تر، ئەگەر کاك وەیسی شەڕی میری سۆران لەگەل ئێزیدیەکان بە پاڵنەرێکی ئایینی تەئویل دەکا، ئەدی شەڕی میر لەگەڵ میری بابان و بادینان لەسەر چە بنەمایەك تەئویل دەکات، خۆ میرنشینی (بابان) و (بادینان) جولەکە و مەسیحی نەبوون؟! هەموو کەسێکی ئاگادار دەزانێ ئەو شەانە شەڕی سیاسی بوونە نەك ئایینی.

هەرچی مەسەلەی کریستیانی بوونی هەندێ لاوی کوردە، ئەمەش هیچ پەیوەندی بە ئیسلامەوە نییە، ئەوەی شارەزای ئیسلام بێ دەزانێ باوەڕبوون بە مەسیح و ئینجیل بەشێکە لە ئیمانی هەر موسڵمانێك، بۆیە هیچ موسڵمانێك نابێتە مەسیحی چونکە خۆی (مەسیحی) و (ئینجیلی)یشە، ئەوەی بۆتە (مەسیحی) تەنیا ئەو

کەسانەن کە هەر بە (نفوس) موسڵمانن، ئەگەرنا پێشتر (مارکسی) و (نادینی) بوونە.

لەمەش زیاتر، کوردە مەسیحیەکان یان ئاشوریە مەسیحیەکان ئەو پرۆسەی بە "مەسیحی بوون"ە بە کارێکی سیاسی دادەنێن نەك ئایینی. ئەو دوو مەسەلەیە لای زۆربەی رۆشنبیران روونن، تەنیا لەلای کەسانی وەك وەیسی نەبێ، کە تەنیا ماوەیەکی کورتە لە هەندەرانە، هەموو شتێکی لەلا ئاوەژوو بووە. هەموو کەسێکی وریا و شیار دەزانێ هەموو گەلانی ئەورووپا و ئەمریکا بەقەد کورد لێبوردەیی ئایینیان نییە. ئەوەتە لە مەسەلەی (بۆسنا)و (ئەلبانیا) و (سەرایێقۆ) و (چیچان) دەرکەوت کە ئەو رۆژئاواییانە چەند درِندەن، بەرگەی بوونی ئەو چەند ژمارە کەمەی موسڵمانان ناگرن!! کام وڵاتی رۆژئاوا هەیە دەستی لە کوشتاری چیچانی و بۆسنی و ئەلبانی نەبێ؟!

وەك وتم، ئەو مەسەلەیە هەر ئەوەندە دێنێ لەسەری بدوێم، بەڵام ئەوەی گرنگە و زۆر کەسی سەرچیخ بردووە مەسەلەی ئەرمەن و کوشتاری ئەرمەنە. بەراستی ئەم مەسەلەیە هەڵوەستەکردنی دەوێ، پێویستە نەوەی نوێ تەواو لەم مەسەلەیە شارەزابێ بۆ ئەوەی چیتر مێژووی لەلا رەش نەکرێ.

لە تۆماری ئەرمەنەکاندا هاتووە کە کوردستان خۆی لەخۆیدا لە رەسەندا زێدی ئەرمەنە کۆنەکانە و بەزۆری بەکورد و بە ئیسلام

کراوە: "ئەو نیشتمانە -کوردستان- چەندین سەدەیە نەتەوەیەکی لەسەر دەژی، وەکو ئێمەی ئەرمەن لە ڕەگەزی ئارین و ئێمەش هەست دەکەین کە ئەو نەتەوەیە زیاتر لەئێمەوە نزیکن وەك لە تورك، بەڵام هەرچەندە کە بەشێکی ئەو نیشتمانەیان-خۆ هەر بەدەستی ئەرمەنییەکانی چاخە کۆنەکان ئاوەدان کراوەتەوە، ئەمڕۆ بەزۆری بەئیسلام کراوەو بەکورد کراوە".[1]

هەروەها لە شوێنێکی تردا هاتووە: "هیچ مەڵبەندێك لەجیهاندا بەقەد مەڵبەندەکانی وان و بەدلیس ئەرمەنی نین".[2]

ئەم بیرۆکەی بە ئەرمەنی دیتنی کوردستان روناکبیرێکی وەك حاجی قادری کۆیی ناچار کردووە کە ڕووبکاتە سەرانی کورد کە وشیار بن، ئەگەرنا دین و نەتەوەتان دەکەونە بەر هەڕەشەی ئەرمەنەکانەوە:

خاکی جزیرە و بۆتان یانی وڵاتی کوردان
سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان
هیچ غیرەت نەماوە، سەدجار قەسەم بە قورئان
پەیدابێ ئەرمەنستان نامێنێ یەك لە کوردان [3]

ئەمە و بەندی (١٦)ی پەیمانی (سان ستیڤانۆ) و بەندی (٦١)ی پەیمانی (بەرلین) دوو بەڵگەی ڕۆژئاوان لەسەر بە ئەرمەنیکردنی کوردستان.[4] ڕووسەکانیش لەپاش کۆدەتاکەی ١٩٠٨ خەریکی جۆشدانی ئەرمەنییەکانی نا دەوڵەتی عوسمانی

بوون، بەجۆرێك لەنێوان سالآنی ١٩٠٨-١٩١٤ ڕووسەکان نزیکەی دەهەزار خەبیر و سەربازی خۆیان لە ناوچەی ئازەربایجان مۆلّ دابوو.[٥] هەرکە شەڕ هەڵگیرسا، ڕووسەکان و ئەرمەنەکان کەوتنە قەتل و عامکردنی خەڵکی وان. هەر لەو بارەیەوە دکتۆر جەمال نەبەز دەنووسێ: "لەنێوان سالآنی ١٩١٥- ١٩١٨ لە ڕۆژهەلآتی تورکیا نزیکەی (٧٠٠) هەزار کورد بەدەستی ئەرمەن کوژراوە. تەنانەت لە ساڵی ١٩١٦ کاتێك سوپای ڕوسی لە ناوچەی حاجی ئۆمەران و باڵەکایەتییەوە بەرەو ڕواندز هاتن، چوار فەوجی ئەرمەنی و فەوجێکی نەستوریان لەگەڵ بوو، ڕۆژی (١٣)ی مایس ئەم هێزانە شاری ڕواندزیان داگیرکرد، ئەرمەنەکان بە بەرچاوی ڕوسەکانەوە کەوتنە گیانی دانیشتوانی ڕواندز، لە ئەنجامدا نزیکەی (٥) پێنج هەزار پیاو ئافرەت و منداڵ بوونە قوربانی، گوایە زۆربەیان بە گوللە نەکوژراون، بەڵکو فڕێدراونەتە گەلی (خەرەند)ی ڕواندز. لە نزیکەی (٢٠) هەزار خانوبەرەی ناوشار تەنها (٢٠) ماڵ بە سەلامەتی دەرچووە.[٦]

ئەو سیڤەرەی کە لەسەر کاغەز بەڵێنی "دەولەتی کوردی" تێدایە، هەر لە هەمان پەیماندا لە بەندی (٨٨)و (٩٣) هاتووە، کە ئەرمەنستان لە چوار ناوچەی تەرابزۆن، ئەرزەڕۆم، وان، بەدلیس پێکدێ.[٧]

هەرچەندە شەریف پاشا زۆری هەوڵدا وەهمی "ئەرمەنستان لە

کوردستان" لەمێشکی یۆگۆس تۆبایی نوێنەری ئەرمەن دەربڕیبێت، بەڵام قۆمیسیایی ئەمریکایی بە وەفدی کوردی گوتبوو، کە ئەمریکا سوورە لەسەر ئەوەی دەوڵەتی ئەرمەنیا دابمەزرێنێ، کە بەشێکی زۆر لە خاکی کوردستان دەگرێتەوە.[8]

لەپاش ئەو هەموو ڕاستییە مێژووییە، شەرم نییە کوردێک لەژێر کاریگەری ئەو سەرچاوانەی کە بە هەموو شێوەیەک هەوڵیاندەدا دەوڵەتێکی ئەرمەنی لەسەر خاکی کوردستان دابمەزرێنن، هەندێ خێڵی کورد بە کوشتاری ئەرمەن تاوانبار بکات؟! لەسەرەوە ڕوونمان کردەوە کە ئەرمەنەکان لە هەموو شوێنێکی باڵادەست بووبن هەوڵیان داوە کورد قڕبکەن، بەڵام "سەرکردایەتی کوردی" نەک نەیویستووە کوشتاری ئەرمەن بکات، بەڵکو هەوڵی زۆریشی داوە کە چەندی پێبکری ئەرمەنەکان لە ئیتحادیەکان ڕزگار بکات، ئەوەتە مەسعود بارزانی لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا دەنووسێ: "لە کوردستانی باشور شێخ ئەحمەد بارزانی هێزێکی پێکهاتوو لە دووسەد چەکداری ناردۆتە کوردستانی بندەستی تورکیا بۆ ئەوەی گیانی چەند خێزانێکی ئەرمەنی ڕزگار بکات، یەکێك لەو خێزانانەی هێزە کوردییەکە ڕزگاری کردووە، خێزانی ئەندراتیك پاشا بوە، ئەوەی شایەنی باس بێت چواردە کەس لەو هێزە کوردییە بەدەست تورکەکان کوژران.[9]

بێ‌گومان هەریەك لە ئەرمەنییەکان و ئاشورییەکان هاوپەیمانی

هاوپەیمانەکان بوون لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا و بەشێکی کوردیش لە سوپای ئیتیحادیەکان دابوون. لە نەزەر ئیتحادیەکان ئەو هاوپەیمانیەی ئەرمەنی و ئاشوریەکان خیانەت بووە لە دەوڵەت، بۆیە هەروەك چۆن ئەرمەنیەکان لە کوشتنی موسلمانی عوسمانی و کوردی دریغیان نەکردووە، دەولەتیش لە کوشتنی ئەواندا دریغی نەکردووە. ئەو کوشتارەش هیچ پەیوەندی بە کورد و ئیسلامەوە نیە، چونکە نە کورد دەسەلاتی خۆی هەبووە و نە دەولەتی عوسمانیش لە سەردەمی ئیتیحادیەکان ئیسلامی بووە، بەلکو هەموو مێژوونووسێکی بەویژدان دەزانێ ئیتیحادیەکان بە واتای وشە "ماسۆنی" بوونە!!

ئەو ڕایەی وەیسی لە سەر دەوری کورد لە کوشتاری ئەرمەندا هیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ لێدوانەکەی تەوفیق پاشای سەرزك وەزیرانی حکومەتی تورکی، کە بەڕاشکاوی تاوانی کوشتاری ئەرمەن دەدات پاڵ کورد و تورکی لێ بەری دەکا، هەروەك دەڵێ: "ئەوانەی کوشتاری ئەرمەنیان کرد کورد بوون".

لەگەڵ ئەو هەموو جەورو ستەمەی ئەرمەن لەسەر کورد و کوردستان، کە هەر تەنها بانگەشەی داگیرکردنی کوردستانیان - باکوری کوردستانیان- نەدەکرد، بەلکو ئیدیعای غەوارەبوونی کوردیشیان دەکرد لە باکوری کوردستان، کوردی باکور لەژێر بەرداشی و فشاری ڕووسی و ئینگلیزی "نۆئیل" واتەنی تەنها یەك

ڕێگەی لەپێش بوو کە دینەکەی بگۆڕێ و بێتە سەر دینی ئەرمەنیەکان!!

لەپاش ئەو هەموو زانیارییە نازانم نورەدین وەیسی داوای لێبورد لەکورد دەکات یان هەروەك مەلای مەشهور بەعەقلی "بشفرێ هەر بزنە!" هەر میر و بەگزادەکانی کورد بەگشتی و هەندێ خێڵی کورد بەتایبەتی تاوانبار دەکات و ئێمەی میللەتیش هەر سەرچیخ دەبا کە شەرم لە مێژووی دوو سەدەی رابردوومان بکەین؟!□

پەراوێز و سەرچاوەکان:

١- گۆڤاری یەکگرتن، نەرویج، نووسینەکەی د.فەرهاد پیربال.

٢- سەرچاوەی پێشوو، هەروەها بڕوانە ژمارە (٩)ی گۆڤاری سەنتەری برایەتی.

٣- کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی، بەغدا، ل٥١

٤- محمد سەلام- لۆزانی ١٩٢٣ و لۆزانی ١٩٨٩٠، ل١٠

٥- Shaw, History of othman Empire

هەروەها بڕوانە لاپەڕە (٦٨)ی هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقی عەرەبیەوە.

٦- محمد سەلام، ل١١ ، هەروەها سەنتەری برایەتی ژمارە (١٦) ، ل٧٧

٧- محمد ئـەمین زەکـی بـەگ، خولاسـەیەکی تـاریخی کـورد و کوردستان.. هەروەها بڕوانە لاپەڕە (٧٢)ی کورد لە ئنسلکۆپیدیای ئیسلامیدا.

٨- د. بلەج شێرکۆ، ئێستا و مێژینەی کورد

٩- سەلام ناوخۆش- هۆکارەکانی لکاندنی ... ل٦٩

١٠- د. بلەج شێرکۆ، ئێستا و مێژینەی کورد

ڕیزای ئەمەش هەر بەگوێرەی پەیمانی سیڤەر بەشێك لە باكووری كوردستان دراوەتە ئەرمەنییەكان!

ئەوەی لەلای ئێمە تابووە Taboo لۆزانە، تەنانەت لە ساڵی ١٩٩٠ كۆنگرەیەكی كوردی لەو شارە بەسترا، سەرۆكی هەرێمی لۆزان خاتوو (یەڤێن جاجی) بێزاری خۆی لە بەرامبەر بەیەكەوە بەستنی ناوی شاری لۆزان لە پەیمانی لۆزانەوە دەربڕی. مـن تەواو لەو قەناعەتەدام كە پەیمانی لۆزانیش وەك پەیمانەكانی دی ئەوسا دژی ماف و بەرژەوەندییەكانی كورد بووە، بەڵام ئەوەی لە پەیمانەكە هاتووە (نووسین- نەك كردەوە) زۆر جودا نییە لەو پەیمان و دەستوورانەی كە بەناو باشن بۆ كورد. با بەكورتی دەقی ئەو چەند بەندەی لۆزان بنووسین، بزانین ئەگەر پیادە بكرابان، ئێستا كورد دەوڵەتی دەبوو یان نا؟!

كۆنگرەی لۆزان لە دوو ماوە بەستراوە، خولی یەكەمی دانوستانەكان لە ٢٠/١٠/١٩٩٢ هەتا ٤/٢/١٩٢٣. خولی دووەم لە ٢٤/٤/١٩٢٣ هەتا ٢٤/٧/١٩٢٣، ئەوەی پێویستە بوترێ لەلۆزان مەسەلەی باشووری كوردستان چارەسەر نەكرا، چونكە شاندی ئینگلیز و تورك نەگەیشتنە هیچ ئاكامێك، ئەوەی چارەسەركرا دروستبوونی دەوڵەتی توركیا بوو. ئەو دروستبوونەش پابەند بوو بە مەرجێكی سەرەكی ئینگلیز، ئەویش ئەوەبوو كە كەمالییەكان بە تەواوی ئیعلانی عەلمانییەت بكەن و خەلافەت

بەیەکجاری هەڵوەشێننەوە، لە بەرامبەریش ئینگلیز بێدەنگ بێ لەسەر بەشی باکووری کوردستان و رازی بێ ئەو بەشە بەشێک بێ لە دەوڵەتی تورکیای نوێ. کەوابێ چارەنووسی باشووری کوردستان کۆمەڵەی گەلان بڕیاری لەسەردا کە بەشێک بێ لە عێراق نەک لە تورکیا. هەرچەندە ئەو بڕیارەی کۆمەڵەی گەلان بە قازانجی تورکیا نەبوو، بەڵام هەروەک پرۆفیسۆرێکی تورک دەنووسێ "گەرەنتی هێمن و تەناهی بۆ تورکیا مسۆگەر کرد".

لەمەتە دەفامێتەوە لە سیڤەر و لۆزان هەر ئینگلیز خۆی بوو نەیهێشت کورد وەک میللەتانی دی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کیانێکی نەتەوەیی خۆی هەبێت!

لە لۆزان پێنج بەند هەن -هەرچەندە بەهیچ جۆرێک باسی دەوڵەتی کوردی ناکەن، بەڵام بۆ بەراوردکردن لەگەڵ دەستووری نوێی عێراق بایەخی هەیە.

لە هەرسێ بەندی ٣٨-٣٩-٤٠ دا هاتووە:

"تورکیا بەڵێن دەدات کە ئازادی تەواو بە هەموو دانیشتوانی تورکیا بدات، بێ دروستکردنی جیاوازی سەبارەت بە زێد و نەتەوە و زمان و رەگەز و دین و عەقیدە".

هەروەها هاتووە: دەوڵەتی تورکیا دەستەبەری ئەوە دەبێ کە کورد کەمەنەتەوەیەکی تورکیا پێکدەهێنێ، بۆی هەیە بە ئاشکرا بەزمانی نەتەوەیی بدوێ، لە دادگاکانی تورکیا بە کاری بێنێ،

ڕۆژنامە و گۆڤار و پەرتوکی پێ دەربکا. بۆی هەیە یانەی زانستی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی کورد زمان پێکەوە بنێ و بەڕێوەبەری ئازادییەوە لەناوخۆ و دەرەوەی تورکیا هاتووچۆ بکاو هەموو ئەو مافە سیاسییانەی دەبێ کە تورکەکان هەیانە.

لە بەندی ۳۷ "تورکیا بەڵێن دەدات کە هەرگیز یاسایەك دەرنەکا یا بڕیارێك دەرنەخا ئەو مافانەی لە هەرسێ بەندەکەی پێشوو خرانە بەرچاو پێشێل بکات."

لە بەندی (٤٤)یش هاتووە "بەڵێنەکانی تورکیا بەڵێنی جیهانین. لەبەر ئەوە بەهیچ شێوەیەك بۆی نییە ئەو بەڵێنانە بشکێنێ، ئەگەرنا ئەو دەوڵەتانەی پەیمانی لۆزانیان مۆرکردووە ئەندامەکانی کۆمەڵەی گەلان بۆیان هەیە سەرپەرشتی جێبەجێکردنی بەڵێنەکان بکەن و تورکیا ناچار بکەن ئەو بەڵێنانە جێبەجێ بکات کە بە دەوڵەتانی داوە."

لەو پێنج بەندەدا: کورد بەشێکی دانیشتوانی تورکیا پێکدێنێ، ڕەگەزێکی جیاوازە لە تورك، مافی ئەوەی هەیە زمانی خۆی لە دامودەزگاکان بەکاربێنێ، لە هەمووی گرنگتر مافی سیاسی وەك تورکەکان هەیە. هەروەها زەماناتی نێودەوڵەتی هەیە، دەبێ تورکیا پێگیریان پێ بکات، ئەگەرنا کۆمەڵەی گەلان ناچاری دەکا کە پێگیری بەو بەندانە بکات!!

ئەمانە هەموو شتی نووسراو بوون!! لە هەشتا ساڵی تەمەنی

کەمالیزمی کۆن و نوێدا چ ڕێزێك بۆ ئەو مافانە داندران؟!
بێگومان نەخێر.

لێرەدا پێویستە بەخۆمان دابچیینەوە، هەر ئەوەندە گرنگ نییە چی لە دەستوور دەنووسرێ، بەڵکو گرنگتر ئەوەیە کێن ئەوانەی دەستوورەکە پەیڕەو دەکەن. من بە موتڵەقی ناڵێم مافەکانی کورد لە لۆزان و دەستووری عێراقی نوێدا وەك یەکن، بەلام زۆر شتی بنەڕەتی کوردی لە دەستووری عێراقدا دیار نەکراون، وەك مافی چارەی خۆنووسین و سنووری کوردستان، ئەو دووە خۆی ناسنامەی کوردێنی بە کورد دەدەن، کەچی هەر ئاماژەشیان بۆ نەکراوە، وەك وتمان زۆر مافی رۆشنبیری و سیاسی لە (لۆزانی شووم!) هەن، هەروەها لە دەستووری عێراقیشدا هەر ئە جۆرە مافانە هەن! سەددامی دیکتاتۆریش حوکمیزاتی بەو سێ شارەی هەرێم دابوو، هەروەها خۆی بەدەیان جار ناوی کوردستانی دەهێنا، کەچی بەدەیان کەس لە کۆمەڵەی نیشتمانی عێراقی دیموکراتی هەن بەقەد سەددام ماف بەکورد ڕەوا نابینن.

هەروەها ئەو زەمانەت و گرەنتیەی لە لۆزاندا هەیە لە دەستووری عێراقیدا نییە، بەڵکو ئەوەی لە دەستووردا هەیە ئەگەر دەستوورەکە پەیڕەو نەکرا، دەستوورەکە هەڵدەوەشێتەوە، کە دەستوورەکەش هەڵوەشایەوە "عەرەبی بالادەست" شەلم کوێرم بە خاکی کورد وەردەبێ. ئەوانەی ئەمڕۆ حوکمی عێراق دەکەن بێ

ناسنامەن، نە ئیسلامین یەکسانی دروست لەنێوان کورد و عەرەب بپارێزن، نە عەلمانین مێشکیان ئەوەندە کراوەبێ غەیری خۆیان قبوڵ بکەن!! لە هەموو نیشتمانی عەرەبیدا "بەهی" یەکی گەورە هەیە لەسەر ناسنامەی عـەرەبێتی عێـراق، یـەکێك لـە شـۆڤێنییەکان دەڵێت: "عروبەی چی! عێراقێك سەرۆکەکە و وەزیری دەرەوەی کورد بـێ، چـی عروبـەی پێـوە دەمێنـێ". وەك بڵێـی ئـەو دوو پۆسـتە کوردێنی بەعێراق دابێ!!

عەرەبی عێراقی بە هەردوو مەزهەبەوە لەو بـارە ئەمنییـە بـێ سەروبەرەدان، ئینجا سەر بۆ داواکانی کورد نانوێنن. ئـەی ئەگـەر سوپاکەیان وەك ئەوەی سەددام پڕچەك کرایەوە، دەبیت چ بقەومێ؟!

ئەو ئەمریکایەی هەتا خۆی و نەتەوە یەکگرتووەکان بە "هێـزی داگیرکەر" ئێستاش بە "هێزی فرەڕەگەزی لەعێراق" نـاوی دەبـەن، کەچی سەرکردایەتی کورد هـەر بـە "ڕزگارکـەر" نـاوی دەبـات، ئەویش لەپێنا بەرژەوەندییەکانی هەر گوشار لە کورد دەکـات، بـە کەمترین ماف لەعێراق ڕازی بێت.

هەموو دەزانین شـیعەی عێـراق ئێـران بـە مەرجـەعی خۆیـان دەزانن، جا ئەوانـە کـە لـە بەرامبـەر عـەرەبی سـوننە باڵادەسـتن لەترسی ئێران چۆن مل بۆ داواکانی کورد دەدەن. ئەو سوننەیەی لە (زاخۆ) تا (فاو) "میر" بوو، ئەمڕۆ چۆن ڕازی دەبێ کـورد مـافی لەو زیاتر هەبێ؟!

ئەوەندە مایەوە ئەو سەرکردایەتییە کوردییەی هیچ هێزێکی پاراستنی نیشتمانی نییەو هەر مژۆڵی دەسەلاتی خۆیەتی، چۆن دەتوانێ بەرەنگاری شیعە و سوننەی عێراق ببێتەوە؟

بۆیە هەقمانە چۆن ڕەشبین بووین بە لۆزان، بە دەستوور و عەقلیەتی دەسەلاتداری عێراقیش ئەوەندە ڕەشبین بین. □

ئەم وتارە لە ژمارە (٢٠٨)ی ڕۆژنامەی میدیا بلاوکراوەتەوە.